شیعر

# دیوانی پاکی

# هاوارێکی بە بێ فریا

دڵ بە هیچ لەت لەت نەبوو لەت لەتی ناوخوێنە بێ
دووره ئاڵای کورد ببینم تا هەموو هێز کۆنە بێ
کوشتمی ئاخ خۆپەرستی و بەرژەوەندی تایبەتی
یەک گرن کەی یەک دەبن ئاخر ئەگەر ئەمڕۆ نەبێ

چاپی یەکەم

# هاوارێکی بەبێ فریا

دیوانی

بورهان سەید گوڵ (پاکی)

چاپی یەکەم

ئاداری ٢٠٠٤ زاینی - نەورۆزی ٢٧٠٤ کوردی

# هاوارێکی بەبێ فریا

## دیوانی پاکی

پێشکەش بێت بە ڕۆڵە ئازیز وخۆشەویستەکـــانم و
بەو خوشك وبرا بەڕێز وئازیزانەی کەڕاستی و وەفا
رووگەو

ڕێبەرو

ڕێڕەوی ژیان و

چرای دەستیانە

بورهان پاکی

# یا رسول الله

کۆڵێ تاوان ها لە پشتم، پەست و ڕوو زەرد مل کەچم
وەك دڵم دزراو بێ یا وون، ڕوو لە قاپیت دێ و دەچم
چاوەڕێی سۆزی وەفاتم، یا ڕەسول اللە دەخیل
بۆیە دەکوڵێ دڵ بە جارێ، هەروەکو شیر هەڵدەچم

پاکی

# ژیان نامەی شاعیر لە چەند لاپەڕەیەکدا

**پێشکەش بێت**

( بەندەتان بورهان سید گوڵ شێخ ئەحمد کوڕی شێخ فەتاح)ی بەرزنجەییە.

١. لەساڵی ١٩٥٧ لەگوندێکی بچکۆلانەی پڕئاوی شیرین کەناوی (کرۆژە)(*) لە دایك بویم و چاوم بەجیهانی ڕەوشەن هەڵهێناوە بۆ حەماڵی ئازار و مەینەت هەڵگرتن

٢. دایکم خوا لێی خۆش بێت عزیزە کچی (واحد بەگی) هیرانی‌یە و دایکی دایکم ناوی عەیشەگوڵ بووە کچی شاعیری پایەبەرزی تەصەوفی کورد (صافی) هیرانی یە.

٣. هەر لەتەمەنی سێ چوار ساڵیدا باوکم ڕووی لە کۆیە کردوە، بۆ یەکەم جار لەگەڕەکی بایزاغا نیشتەجێ بووین و هەر لەم شارە خۆشەویست و زانست پەروەر و خنجیلانە خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیم تەواو کردووە و پاشان چویمە ئامۆژگای تەندروستی ئاژەڵ لە بەغدا بۆ ماوەی سێ ساڵ ، پاش تەواو بوونی ئەم ئامۆژگایە فەرمانبەر بویم لە شارۆچکەی سیدەکان لە ساڵی ١٩٧٩.

پاشان گوازراومەتەوە بۆ شارۆچکەی دێگەڵە (شۆڕش) لەوێ دەست بەکاربووم هەتا ساڵی (١٩٨٥) ئینجا بەهۆی هەڵوێستی سیاسیم و دوژمنایەتیم بۆ ڕژێمی بەعس لەسەرکار لابرام تاکو ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١. دووبارە گەڕامەوە سەرکارو هەتا ساڵی ١٩٩٦.

بۆ دواجار ڕووم لەهەندەران کردووە و تۆزی غوربەتم لێ نیشتووە هەتا ئەمڕۆکەو ئەو چرکەی ئێستا ژیان لە هۆڵندا دەبەمەسەر دوور لەهەموو دۆست و خۆشەویستان.

(*) کرۆژ دێیەکە نزیك شاری کۆیە لە دوڵی سماقوڵی یە کە چەندجار لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە سوتاوە وخاپور کراوەو کەوتۆتە بەشی ڕۆژهەڵاتی کۆیەو ماوەی (٢٥) کیلۆمەتر لەم شارە خنجیلانەدا دوورە هەروەها ئەم گوندە لە (٣٠) ماڵێك پێك هاتووە لەسەرەوەی گوندەکە کونێکی گەورەی دوور ودرێژ هەیە کەناسراوە بەکونی کرۆژ وگرنگی یەکەی لەوەدایە کەڕووبارێکی پان وبەرین وگەورەی لێ هەڵدەقوڵێ وبەناوەراستی گوندەکەدا دەڕواو گوندەکەی کردووە بە دووبەشەوە.

**بەڕێز و ئازیزان**

لەوەتای دونیا دونیایە و زەمانە و فەلەك وەك چەرخ و فەلەك خول و سوڕ بەدەوری خۆیدا بداو پەیمانی بێ بەڵێنی و بێ وەفایی خۆی بۆ خەڵکی سەرجیهانی کۆن ونوێ تازە ونوێ بکاتەوەو سینگ دەر پەڕێنی و خۆهەڵکێشان و چاو زەق کەرەوەی خۆی لە مەیدانی مانەوەی هەمیشەیی ژیان و زیندەگی دەر بپڕێ و شانازی پێوە بکاو...؟؟؟

تاکو ڕمبازی هەوڵ و ڕاکەو پشودان و حەسانەوە و ماندو بوونی بێ وچان خاڵی بە گرنگی سەرەکی ژیان بێ و...؟؟؟

تاکو مرۆڤ لەحەزو ویست و هیواو ئارەزووی ژیان تێردەبێ و ؟؟؟

تاکو ڕۆژ بەدوای شەو هەروەها شەو بەدوای ڕۆژ خول بداو تەواوکەری ژیان بێ و...؟؟؟

هەتاکو ناخۆشی بە خۆشی و خۆشی بەنا خۆشی لەمەیدانی گۆڕەپانی گۆڕانکاری هەمیشە بەردەوامی ژیان سەرچۆپی بگرێ و...؟؟؟

هەتاکو زاناو پرۆفیسۆرو فەیلەسوف و کەڵەپیاوە گەورەکانی تێنووبە زانست ، لەزانست تێر دەبن دڵیان پێیەوە ئاو دەخواتەوە وبڕی تەواویان پێ دەشکێ ؟؟؟

هەتاکو ئاسمانی بەرفراوان گەورەو بەرین و بێ پێچکە و ستوون و بێ کۆڵەکە وەستای دەستی سروشتی خودایی بێ و بە چاوە زەقە کاڵە شینەکەیەوە کەوڵ و فەرش و پەخشی خۆی بۆ خۆی بێ و بڕوانێ بەم زەویە کۆن و دڵ ڕەقە کەکەس نازانێ بەتەواوی چەند میر و پاشا و سولطان و فەرمان ڕەوا فەرمان ڕەوایی یان لەسەردا کردوەو...؟؟؟

هەتاکو گرمە زرمە و شەق وشریخەی هەورە بروسکەو شریقەی لەسەر شاخ و چیا و کێو و قەدپاڵ و گرد و هەردوو هەوراز و لوتکە و دوند و بەندەن و تەلان و گەوەڕ و دەشت و کۆسار و پاوان بچریکێنێ و بگرمێنێ و بهاڕێنێ و وەکو مین و بورکان وبتەقێتەوە و ئاسمانی حەوتەمین بخاتە جموجوڵ و جۆش و خرۆشەوە و...؟؟؟

هەتاکو کانی وکارێز و جۆگەلەو جۆگە و گۆم و گۆماو تاڤگەو ڕووبار بەست و جۆبار دەریاچەو دەریا ئەمانە هەمووی بە تاك و بەکۆ بەخوڕ و لەسەر خۆ بەهۆی ڕێژنە

بارانی بەخوڕ لەدایك ببنەوە و تێکەڵی یەکتر ببنەوەو هێزێکی یەکگرتووی شینی گەورەی بەهێز پێك بهێنن کە سێیەکی وشکانی داگیر کردبێ و...

هەتاکو ئەڤین و دڵدار و دڵبەر و ئاشق و ماشوق یەکتر لە باوەش بگرن و لەناو یەکتری بتوێنەوە و ئاوێتەی بۆتەی یەکتر بن و عەشق و خۆشەویستی داگیریان بکا و داستانی عەشق و سۆزی پڕ خۆشەویستی شیرین و فەرهاد ، خەجێ و سیامەند ، شەم و شەمزین ، مەم و زین ، لاس و غەزال بەسەر زمانەوە شیرین و سەردەستە و سەرلەشکر و سەرقافلەی کاروانی ئاشقانی کۆن و تازەو داهاتووی هەتا هەتایە بن و بەسەرهات و یادیان لەبیر نەچێتەوە و هەردەم ڕوگەو و هەوارگەی دڵداران بن و سوێندیان پێ بخورێ و...؟؟؟

لەوەتای ماف و ڕاستی وەکو فسفۆر لە قورگی زۆڵ و زۆردار ڕەنگ و شەوقی داوەتەوە و وێنەی دوپشك کلکی لەسەر پشت بنێ و تۆز بکا و بێ شەرمانە و زەق لەجیهانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوی وەکو ئەمڕۆ و ئەو سەردەمە لەهەرە لوتکەی بەرزی دەنگی ناڕەوای گوێی خەڵکانی جیهان کاس بکا و...؟؟؟

ئەوا نوکی تیژی زێڕینی پێنووس و قەڵەمیش لەسەر پەڕە کاغەز تێر نەبووە و بڕی نەشکاوە و هەمیشە گەوهەر بارینی وشەی زێڕینی بێ ژمارەی نووسەریش کۆتایی نەهاتووە و...؟؟؟

بەردەوام وهەمیشە کۆتایی نایێ و لەدەریای قوڵی بێ بنی پڕ لە هەست و خەیاڵ و بیر و ئەندێشە و زانست و زانیاری مەلەوانی زۆر ئازاد و سەربەست تیا کردووە و لەسەر دوندی لوتکەی کێوی بەرزا هەردەم حوکمڕانی خۆی کردووە و پەنجەچاوی ڕاستی بەڕووی بینای چاوی زۆڵ و خۆفرۆش و نەیاران کردووە و گرێ کوێرەی پرێسکەی کۆڵی ئازاو ناخۆشی پشتی چینی چەوساوەو شان بەقوڕ کردۆتەوە و قورسایی پشت و باری سەر شانی لە سەختی و مەینەتی ئاسان کردووە هەمیشە ڕاستی لەچەوت و ، پاکی لە ناپاکی، دادوەری لە ستەم و، بەرزی لە نزمی و، سپی لە ڕەشا جیا کردۆتەوەولەتەرازوی محەکی ڕەوایی و ناڕەوایی داون...

بەڵام دڵسۆز و بەڕێز و خۆشەویست و ئازیزان منێکی دەربەدەرو ڕووت وبێ شوێن و دیل و بەند و بێ خۆشی و هەمیشە حەزو ویست خنکاو ژێر چەپۆکی هەزاران دارو دەستەی زۆڵ و زۆردارو ڕێبواری دوا شوێن پێ هەڵگری قوتابی ومامۆستای قوتابخانەی شاعیران ؟؟؟

چوزوانم شیعرو هۆنراوە چییەو کەی هەڵدە قوڵی ولەکام گۆشەو نهێنی ئەم جیهانە زل و زەبەلاحە بێ سەرو شوێنە سەری هەڵ داوەو لەناو ڕیشەو سینە پشکۆی کام داخ لەدڵ و خەفەت بارو سەرهەڵگر سەری هەڵداوەو چاوی ڕەوشەنی بەجیهانی ڕەوشەن هەڵهێناوە و لەدایك بوەو وەکو منالێکی تاقانەی شیرینی چاو ڕەشی لێو بەبزەو خەندە لەسەر ڕوو پەروەردە کردوەو گەورە بووەو ناوی شیعری پێ بە خشیوەو ئێمەش ئەمڕۆ هەتا دونیا دونیایە بە بەژن و باڵای نازداری دا هەڵ دەڵێین و لەژێر سایەو سێبەری خۆشی و ناخۆشی کۆڵمان نەداوە و مەستی ماناو تام و بۆنی بووین و وەك دەسکە گوڵی بۆن خۆش کە تاکو ئێستاش بۆنی پەڕەی وشەی گوڵاوی خەڵکی سەرجیهانی کاس کردووەو پێی مەستین ؟؟؟

پاشان مەردانە وچالا کانەو ئازایانە و گورجو گوڵ پێشکەش بە میللەت و نەتەوەکەی کردووەو بویتە خۆشحاڵی ئێستاو چینی داهاتوومان و ڕابوردومان وجێگای شانازی و سەربەرزیمان بەڵێ ئەمە لەتوانای مندا نیە وبابمێنێ بۆ مامۆستا و کەڵە پیاو و زانا گەورەکانی ڕاهێنەر و دامەزرێنەری بەردی بناغەی قوتابخانەی باخ و گوڵزاری کۆشکی ڕازاوی ئەدەب و شیعر بەتایبەتی ؟؟؟

بەڕاستی خۆشەویستان ماوەیەکی زۆر لەمێژبوو هەردەم خولیای ئەوە بوم و بیرم لەوە دەکردەوە ، ئایە قەت دەبێ ڕۆژی کات و دەمێ بێ بۆم بلوێ و مەرگ مەودام بداو ڕاکە ڕاکەی ئەسپی پڕتاوی گیان کێش لەپڕو لەناکاو نەفەس بڕاوو شادبە باوەشی گڵم نەکاو دڵە قوڵە قەبرە پڕنهێنیەکەم کەپڕە لە خۆزگەو بریا خۆزگەبڕ نەکاو لە لێدان نەوە ستێنی وڕێگام بۆ خۆش بکا و بتوانم خۆش بەختانە لەڕووی ئێوەی ئازیزو بەڕێزو خۆشەویست و هەمیشە لەدڵ وتێنوو بەڕووتان چەپکێ لەهۆنراوەکانم ئەگەر گرچ وکاڵیش بن وسادەو لاوازیشبن پێشکەش بکەم.

بتوانم یا توانیبێتم وەك تێلەکێشێ ماندوو هیلاك بەدوای خڕکردنەوە و کۆکردنەوەی گوڵە مەلۆی شیعرو خستبێتمە سەر خەرمانی گەورەی ئەدەب و شیعر بەتایبەتی.

بەهیوام ئەم هەوڵ وتەقەلایە بوو بێتە مایەیخۆش بەختی میللەتەکەم بۆ ئێستاو دوا ڕۆژو ئایندەمان.

بائەوەندەشتان لێ نەشارمەوە لەوەش ترسم هەبوو ئەگەر ئێستا خۆم هەتا ماوم هەوڵ و پەلەی چاپیان بۆ نەدەم ئەوا دوایی وەك میللەتەکەم پەرت و بلآوو بێ کەس و هەتیو بن و کەس بەخۆیان نەگرێ و باوەشی گەرمی خۆشە ویستیان بۆ نەکەنەوە وەك پێوست و بینە ئاردە ڕژاوی نێو دڕك و دوایی بۆم کۆنەکرێتەوە ...؟

هەرچەندە جارو باریش بیرم لەوە دەکردەوەودڵنیابوم کەڕۆڵەکان و دڵسۆزان ئەوا ئەو ئەرکە دەخەنە ئەستۆو دەستی درێژی یارمەتی وفریاو دڵ سۆزیان جێگای متمانەی ئێستاو دوا ڕۆژی من بوو خوای گەورە تەمەن درێژ و سەرکەوتوو هەر زۆریان بکات.

لەوانەشە هەندێ لەهەقاڵ و ڕەخنەگران پێشنیار و ڕەخنەی ئەوەیان هەبێ هۆنراوەکانم تازە و ئازاد نین وئەمڕۆ کێ دەیان خوێنێتەوە و باویان نەماوە و کێ سەیریان دەکات؟؟؟

منیش بۆ وەلآمیان بەو بەڕێزانە دەڵێم لە ژووژکیان پرسی بۆچی بێچوەکەت هێندە پەڕ ڕەق و تیژ و ناشیرینە؟

ئەویش بۆ وەلآم وتی هیچ بێچوەك لە بێچوی من ڕەزا سوك تر و شیرین تر و نەرم تر نییە و نایەتە بەرچاوم.

منیش کاکی بەڕێز هۆنراوەکانم بەبێ حەد خۆش دەوێن و بەنرخن لەلام ئاخر چۆن خۆشم نەوێن هەموو سەرمایەو ژیانم بوین وەلەخۆشی و ناخۆشی و شیرینی و تاڵی هاوبەشیان لەگەڵ کردووم و شەونخونیم لەگەڵیان کردووە و ئازارم لەگەڵیان چەشتووە داخی زامی قوڵی دڵی چارم بەوان چارکردووە و بڵێسە و پشکۆی ئاگری دەروون و دڵە سوتاوەکەم هەر بەوان کوژاندۆتەوە و ساردکردۆتەوە و فەرامۆشی هەموو ناخۆشیەکەم بەخۆشی وان داوەتەوە وهەمیشە نوشتەی سەرشان و سەرسەفحەی لاپەڕەی دڵم بوین و

ڕاددەی خۆشەویستیان لەچەقی ڕیشەی گیانی لاوازم و جەستەی بێ هێزم داکوتاوە و چەقاندووە.

باوەڕم نایە قەت لەگەڵ خەم منیان بەجێ هێشتبێ و ساتێ لێم جیا بوبنەوە و بەبێ یەکتر هەڵمان کردبێ و هەرسێ لامان گیانی بەگیانی یەکتر بووین و لەیەکتر دانەبڕاوین و لەیەك نەتۆراوین ئەگەر تۆراش بین ئەوا بۆماوەیەکی کەم و کورت بووە و پاشان زۆر بەخێرایی دەستمان لەملی یەکدی کردۆتەوە و یەکترمان لەباوەش گرتووە و بەسۆز و خۆشەویستی یەکتریمان گوشیوە و خەم ڕەوێنی یەکتری و مەرهەمی زامی قوڵی یەکتری بووین.

بۆیە ڕەخنەکانیشتان گەورەم دەکا و وەکو گوڵ لەیەخەم دەدەن و شاد و بەختەوەرم دەکەن و پێی دڵ خۆش دەبم و ڕێنمایی هەڵەکانم دەکەن بۆ ڕاست کردنەوە و ناتەواویەکانم تەواو دەکەن و بەرەو پێش چوونی پێشکەوتنم دەبەن و لەدەرکی خەواڵوی خەمیی هەمیشەم دەدەن و خەبەردارم دەکەنەوە ، بەڵام بەمەرجێ لەدڵی پاك و ڕاست و بێ گەردەوە هەڵقوڵابن ئیتر بە هیوای ڕەزامەندی هەموو لایەکتانم و بە دڵی گەورەو پڕ بەزەییتانەوە چاوەڕوانی چاوپۆشینی کەم و کوڕیەکانم و ئەگەریش نا ئەوا بەم چەند دێرە وشە کوردیە شیرنانەم بەخشن کە زمان و کلتور و تاپۆی موڵکی ڕاستەقینەی ڕەسەنی کوردایەتی باب و باپیرانە و من وەك یادکەرەوەیەك بۆئێوەم خستۆتە سەر کاغەز و بەر چاوو پێشکەشم کردوون و هەرئەوەندەم لەدەست هاتووە و دەسەڵاتم زیاتر بەسەریان دانەشکاوە ئەگەر ئەوەش نا؟؟؟

ئەوا بەو تۆزە غوربەتیەم بەخشن کەتیا نوقم و پێی سواغ دراوم و دووری نیشتمان و هەموو خۆشەویست و دڵسۆزانم.

هەردەم بەهیوام بێ هیوا نەبن و بەختەوەرو شادو کامەڕان وسەرفراز بن

پاکی

## ئاڵای کوردستان[1]
## پێنج خشتەکی شیعری پاکی

ئـــەی وەتـــەن گـــەر جوانـــە مـــەرگی تـــەوقی ئەســـتۆی تۆمـــەوە
دوای لافاوی بـــەگوڕی خوێـــن و جـــــەرگی پـــــڕ پشــــکۆمەوە
ڕووی درنــــــدەو زوڵ و، ســـــپڵە و مەینـــــەتی دەی خۆمـــــەوە
بـــەس دەڵێـــم مـــــوژدە شــــەهیدان لـــــەبری داد و ڕۆمـــــەوە
نـــــامرم ئـــــاڵای کوردســــــتانم دی بــــــەچاوی خۆمـــــەوە
دێ شـــــەکاوەیبەرزی لوتکــــــەی قـــــەندیل و، ئاکۆمـــــەوە

* * *

ئـەی وەتـەن گـەر دایکـی ڕەش پـۆش سـینگ کوتـاو بـوو قوڕبەســەر
نوقمـی ژێـر دەریـای جـەفابوو پێـش بڕکـەی مـەرگ و، کەسـەر
شـارو دێ نوغـرۆ و وێـران بـوو کونـدو قـەل خوێنـدی لەسـەر
سـەد شـوکر ئـەمڕۆ لەسـایەی پەرلـەمانی کەوتـە سـەر
نـــــامرم ئـــــاڵای کوردســــــتانم دی بــــــەچاوی خۆمـــــەوە
دێ شـــــەکاوەی بـــــەرزی لوتکــــەی قـــــەندیل و ئاکۆمـــــەوە

* * *

[1] ئەم هۆنراوەیە بەبۆنەی دامەزراندنی پەرلەمانی کوردستان وشەکاوەی ئاڵای کوردستان لەهەولێر و هـەموو کەنێن و قوژبنێکی خاکی کوردستان ساڵی ١٩٩٢ دانراوە.

ئـەی وەتـەن گـەر ریـش سـپیمان بـوو لـە ژێـر زللـەو، شـەقا
قیـژەو، زیـڕەی باوکـە رۆمـان نـەچووە نێـو گوێـی دڵ رەقـا
کوڕپـە سـاوابوو سـەری گـۆ، ژێـر پۆسـتاڵی رەش تـەقا
سـەد شـوکر ئەمرۆکـە ئـاڵای دژ رەقیـب نـاو چـاو چـەقا
نـامرم ئـاڵای کوردسـتانم دی بـەچاوی خۆمـەوە
دێ شـەکاوەی بـەرزی لوتکـەی قـەندیل و ئاکۆمـەوە

* * *

ئـەی وەتـەن گـەر خـاك و خۆڵـت ئاوێتـەی مێشـك و سـەرە
کـوێ بـڕۆی بورکـان بـە خوێنـی لاوە ئـەم دەشـت و دەرە
هـەر تراژییـا وکارەسـاتت بـێ بـەیان سـەد دەفتـەرە
سـەد شـوکر ئـەمرۆ لەسـایەی بـوو ئـازادی نۆبـەرە
نـامرم ئـاڵای کوردسـتانم دی بـەچاوی خۆمـەوە
دێ شـەکاوەی بـەرزی لوتکـەی قـەندیل و ئاکۆمـەوە

* * *

ئەی وەتەن گەر مەرگی لاومان بوو گەڵای ژێر بای خەزان
ژێر وزانا بوون بە ژێر دەست ناکەس و کۆیلە و نەزان
ئاهو ناڵە و کۆچ رەوی تۆ گوێی نەگرت کەس رووی زەمان
سەد شوکر ئەمڕۆ نەیارت بۆ گەدات بە غولام رەزان
نامرم ئاڵای کوردستانم دی بە چاوی خۆمەوە
دێ شەکاوەی بەرزی لوتکەی قەندیل و ئاکۆمەوە

**پاکی**

**پایزی ١٩٩٢**

## ئەی وەتەن[1]

## شەش خشتەکی شیعری پاکی

ئـــەی وەتـــەن قـــەت وامەزانـــە دڵ لـــە دووریـــت بـــێ خەمـــە
شـــەو خـــەریکی بـــەزم و شـــادی و پەرچـــەم و ســـینگ و مەمـــە
ڕۆژ کەمەســـتی مـــەی شـــەراب و زەوقـــە لـــەو مـــێرگ و چەمـــە
کـــون کونـــە جـــەرگم لـــەتاوت دڵ دەســـوتێ وەك ، شـــەمە
گـــەر لـــە دووریـــت خـــاکی عالـــەم بـــێ و بەســـەر خـــۆم کـــەم کەمـــە
خـــاك و بۆنـــی دڕك و داڵـــت بـــۆ دەوای دەرد مەرهەمـــە

* * *

ئـــەی وەتـــەن ســـەد جـــار دەرم کـــەن دێمـــەوە و قوربـــانتم
ڕۆژ و شـــەو هـــەردەم بـــەفیدای دێمـــەن و ســـامانتم
چـــۆن لـــەبیرت کـــەم کەڕۆڵـــەی شـــاخ و دۆڵ کێوانتـــم
ڕۆژی هـــەل ئاگابـــە ژێربـــە دەســـت نـــەدەی ئامـــانتم
مەرجـــە تـــا دەمـــرم لەشـــینی دەردی بـــێ دەرمـــانتم
خـــۆ پەرســـتی و کینـــە تاکـــەی والـــە دڵمـــان ســـەرجەمە

* * *

، ئـــەی وەتـــەن بـــەخوا بـــەبێ تـــۆ هیـــچ و بـــێ نـــرخ و کـــەمم
وەك فوراتـــە ئـــاوی چـــاوم کێـــوی ئـــەڵوەندە خـــەمم
بێـــت لـــە دونیـــای تـــاریکیدام هـــەی چـــرای لالـــەو شـــەمم
بـــەس لەدەســـت بـــاچیم بەدەســـتە مـــن کـــە وەك هـــەور و تـــەمم
گـــەرمی ناکـــا ئاســـنی ســـارد قـــەت بـــە هـــێزی فـــوی دەمـــم
ئاســـۆی ســـەرکەوتن نزیکـــە نـــەك هیـــوای شـــەڕ بـــەو دەمـــە

ئەی وەتەن باوەڕکە جەرگم تیری ناکۆکی بڕی
خوێنی من بوو هەر لەکاسە مارك و دۆلاریش کڕی
هەرچی هات لێم بوو بە میکرۆب لاپەڕەی خۆشی سڕی
سەیری زامم کەن بە مەرهەم کێ هەبوو کوا کۆی خڕی
بەرلەوەی بم خاتەشادی جاریٚ زوو پێم هەڵپەڕی
مردنە بەخوا نەبین کۆ ژیرنەبین لەو سەردەمە

* * *

ئەی وەتەن ناڵە و سکاڵاو داد و هاوار کارمە
خەم جەفاو ئازار و مەینەت کۆڵە پشت و بارمە
بۆ تەقینی نارنجۆکی ڕوو لە یەك هاوارمە
قوڕبەسەر ماوم کە کێندەر خاك و گوند و شارمە
شین بۆ ئەمڕۆکە دەگێڕم نەك خەمی چووی پارمە
ئاخ دەبێ ڕۆژێ لەسەرمان خوایە لادەی ئەوتەمە

* * *

ئەی وەتەن کوژراوی تیری دەستی نامەردم ئەمن
وا لەداخت گێژ دەخۆم وەك تۆز و باو گەردم ئەمن
شاهێدم ئەسرینی چاوە چت لە ڕووی زەردم ئەمن
جاریٚ بڕوانە لەڕیشەی جەرگی پڕ دەردم ئەمن
سەیری چۆن ئاسمانی داگرت ئاهی پڕ سەردم ئەمن
تابەکەی بڕوابە فیرۆ دژ بە کورد ئەو بەرهەمە

ئــەی وەتــەن باوەڕ کــە کــوردم کــویٚ بــڕۆم نــایێ لــەبۆم
کــوا بــەهام مــاوە لەعالــەم بۆتــە پــارەی چــایێ بــۆم
دەنگــی مــافیش دێ بــە گــوێی زۆلٚ هــەروەکو بــایێ لــەبۆم
نۆکــەریش نــادا لەبــەختم خــۆی بــەهیچ شــایێ لــەبۆم
بۆیــە هــەر بــەرقاپی کــەوتوم قــەت نــەبوو یاســایێ بــۆم
بەچکــە کــورد خزمــەت ڕەقیــب کــا ئــەی بــرا چــەند ئەســتەمە

＊　＊　＊

ئــەی وەتــەن هەرچــەند بــەوردی بــیر دەکــەم هــەردەچم ودێــم
تاهــەرەس هێنــانی کۆشــان نەبتــە وانــە وایــە پێــم
مــن دەبــێ دیــل تــۆش هــەراج بــی دوورە ئــازادی لــەرێم
بــەس ئــەوەی پــێ ی جوانــە مــەرگم هــەر ونــە تــا ئــەمڕۆ لێــم
یــەك بــە دوژمــن ، دوو بەدڵســۆز ، ســێ بەســەردار کــێ بڵێــم
ســەر بــەخۆبام بــۆ لەعالــەم مــن دەبوومــە ســینەمە

＊　＊　＊

ئــەی وەتــەن چــاو زەق کــە چــاوی گــەورە ســەرما دارەکــان
کاربەدەســت و لێ پســراوو زگ زل و کــارگێڕە کــان
هــەر هــەمووی تێکــڕا بــە خــاوەن بــەنق و کارگــە گــەورەکان
بێــژە ژێــر خــاك زێــڕ دەبینــن بــەس عیلاجــی زامــەکان
کــەی دەکــەن تــەفرەش هەتاکــەی بــۆ هــەژار بــێ دارەکــان
تــف لــە ڕووی ناپــاك و زۆلٚ و کــۆی دۆلارو درهەمــە

ئــەی وەتــەن مەجنونــە حـاڵم گــڕ لــە گیــانم بــەر بــووە
دەردێ توشــم هیــچ پزیشــك و شــێخێ تێــم ناگــا كــووە
بـەس ئـەوەی زەق داغـی كــردوم بۆچـی مـیر هــەر خــەوتووە
سـەیرە نـامرێ چــۆن دەڵێـن پـێ ی نیشـتمان شـوی كـردووە
یــا بــە خــاكی خــۆی تـێ ناگــا یاكەمــەو هــەر بــێ ڕووە؟
داخــی گورگــە شــوان نــەبا بــۆ كــون كــون و ڕەش سـینەمە

* * *

ئــەی وەتــەن بریــا منیــش قــەت ئــەو هەموخۆزگــەم نــەبا
ســـەرفراز بــام و ولاَتیــش سەربەســەر ئــازادی بــا
ڕۆژێ یــەكترمان لــە بــاوەش یــەكتری كــرد بــاو تــەبا
گۆشــتە خــێر چیــتر نــەبوبام خــاوەنم ئــەمنیش هــەبا
دوژمنــانم هیــچ بــرام بــۆ كەڵلــە كاســەی مــن دەبــا
هــەولّی چــارێ دەن دەڕابــن لــەم قۆنــاغ وسیســتەمە

پاكی
١٩٩٥/٨/٨

## با بسووتێم

خـــۆم دەزانم ئـــاگرێکی چـــۆن لــــە جـــەرگم هـــــەڵکرا
هەرشـــەوەی کۆلانـــی شـــاری بویتـــە مـــاڵم ئـــەی بـــرا

لێـــم گـــەڕێ توخـــوا لــــەداخی غوربـــەتی و تـــەنگی دڵـــم
بابســـووتێم دابگیرســـێم هـــــەر وەکـــو لالــــەو چـــرا

هەرلـــە ڕۆژی زوو لــــەپێناو چـــەند کەســـانێکی دەنـــی
ســـەیری چـــۆن جەرگـــەی ولاتم پارچـــە پارچـــە بـــەش کـــرا

کـــوردو بـــەد بـــەختی لەڕاســـتی دوبـــرای جومکـــەن کـــەبوون
بۆیـــە زگ مـــاك بـــوو خـــەلاتی هـــەر ســـێدارەی پـــێ درا

تابەکـــەی ئێمـــە لەڕاســـتی لا بدەیـــن کـــام جـــە ژنـــەبوو
بـــەرگی ڕەشمـــان هـــەر نەپۆشـــی و قـــوڕ لـــە ســـەرمان لابـــرا

ئـــەی نـــەبوو کـــەی چـــاوی ڕەشمـــان ژێـــرە دووپوســـتاڵی ڕەش
ســـاکەوابێ شـــەرمە ڕۆڕۆی دەســـت بـــرا ڕۆی دەســـت بـــرا

چـــۆن دەبـــێ دۆســـت دوژمنـــی خوێـــن فێـــڵ لـــەخۆیی کردنـــە
هـــەر وەکـــو ســـاواری سەرڕســـت کـــەی بـــووە چـــۆن هـــەڵ خـــرا

ڕازی دڵ بۆکـــێ بـــەیان کـــەم کوانـــێ دڵ گـــەرمێ بـــەحاڵ
دەرکـــە والای مـــاف لـــەکوێ یـــە بچمـــە کـــام دادگـــاو ســـەرا

**لیربروك - هولندا**
**١٩٩٧/٧/١٠**

# ئـــاخ

ئـــاخ لەدەســـت گـــەورانی ئـــەمڕۆ تـــا بەکـــەی بـــەس مەینـــەتی
دەربچـــم چاکـــە لــــە بوونیـــان کوانــــێ خۆشــــی و زینـــەتی

تاکـــە ئاواتمـــان بەتەنـــها ڕۆژێ کـــورد ئـــالآی هـــەبێ
ســـەیری ئـــەمڕۆ دژ بـــەخۆیتی لێـــم دژە وەك پـــێ پـــەتی

بـــیر و زانســـت و هونـــەریان کوشـــتن و تالآنـــە هـــەر
ڕۆنـــە هیوایـــان بـــەجارێ بـــۆ نـــەمانی تۆیـــەتی

دەنـــگ و ناڵـــەو بوونـــی یاســـا وا دەبـــێ یـــاوا دەکـــەین
پێوەدانـــی بـــۆق لـــە مـــار زۆر پیســـترە بـــێ فرســـەتی

کـــامی دڵســـۆزە لـــەکاری بێتـــو گـــەر بڕوانـــی ورد
تـــێی دەگـــەی هـــەوڵی بەتەنـــها ورگ و باخـــەڵ خۆیـــەتی

هـــەوری خـــەم بـــاری بەســـەرمان پێکـــەنین و خـــەندە چـــوو
دڵ لـــە کـــار وەســـتا و منـــدالآن تۆقـــی تـــرس و لـــەرزیتی

لێـــو بـــەبار و دڵ بـــە زام و ڕەش دەپۆشـــن گەنجـــەکان
ڕوو لـــە کـــۆی کـــەن ســـۆزی دەنگـــی باوکـــە ڕۆ یـــا برایـــەتی

کـــام جێگایـــە نـــەبووە مایـــە بـــۆ گۆڕســـتانی شـــەهید
ســـوێندی نـــاوێ شـــاهێدە خـــۆی جـــەنگی پـــول خـــۆ کوژیـــەتی

تــۆ لــە خــاکی خــۆت بــە زەبــری هــێزی شــەق بارکـــەی دەبــێ
ئــەم بـــەر و ئـــەم بـــەر بــۆ مـــاڵت باوکــەڕۆ ســـەد شـــەڕیەتی

تــۆ بـــەڕێوە تـــازە دەرچـــووی ســـوکە ئـــاوڕێ گـــەر بـــدەی
خانووداگــیر ، مــاڵ بـــوو تـــالان ، وەك مـــیرات بـــۆی بەشـــیەتی

بێــژە گــەورەم چــی بــوو تـــاوان وای بەســـەرهات پێـــت دەڵـــێ :
دژ حــیزب بــوو ، دوور بـــوو لێمـــان ، بــیر و ڕای ئـــەو هەیـــەتی

دەرچـــێ چاویـــان بـــا نـــەمێنن ئێمـــە بـــێ بـــاکین لـــەوان
نابـــێ ئێمـــە بـــێ لـــەناومان گشـــت دزی و ڕێگریـــەتی

ئـــەو هـــەموو تاوانـــە زۆرەی وا بـــەچاومان دەیبینـــین
کـــۆی ئەوانـــەن چونکـــە کـــاری نـــاڕەوا پـــڕ خوێنیـــەتی

گــوێ گــری ســاڵێ بــەبالای ئــەو هــەزارە بــۆت دەڵــێ
بــەس لــەدڵ دا شــینی مــارك و گلــدن[2] ودۆلاریــەتی

کــوا وەفایــان ڕاســتی وایــە ؟ گــەورەیی چــۆن وا دەبــێ ؟
گۆشــتی کــەو هــەردەم مــەزەی بــێ و مــامزیش ســێ جەمیــەتی

پــێی بلــێ قوربــان بــەهار بــەس بــا بــەخوێنی لاو ببــێ
پێــت دەلــێ ئــازادی وایــە ئــا ئەمــەش جــێی خۆیــەتی ؟

[2] ) گلدن جۆرە پارەیەکی هۆڵەندیبوو بەلاّم ئێستاکە بۆتە یۆرۆ.

خوێـــن ڕژان ئــاوه لــەلای ئـــەو مەرجـــە کورســـی خـــۆی هـــەبێ
هـــەرچی چـــوو دیـــاره شـــەهیده کـــێ بـــرای یـــا کوڕیـــەتی؟

باســـی شـــادی و بـــەزم و خۆشـــی و بـــانگی ئـــازادی دەڵـــێ
وا لـــە ئـــەم لاخوێـــن ڕژانـــە و گرمـــە گرمـــی تۆپیـــەتی

ڕاوی ڕێـــوی هـــەر بـــۆ کەوڵـــە ئـــا ئەمـــە پـــەندە لـــە کـــۆن
داخەکـــەم ویـــژدان کـــە نـــەبووە گـــەر هـــەبێ خـــۆی دژیـــەتی

دەســـــتەیێ کۆنـــــە لـــــە مێـــــژە فـــــێری ڕەقـــــص و چەپڵەیـــــە
دیـــاره هـــەندێکیش لـــە دەوریـــان دێ و دەچـــی وەك کەریـــەتی

وەك دووپشـــك و مـــار لەســـەرپێن گشـــت دەمـــێ بـــۆ پێـــوەدان
وا لەبـــەر دەرگایـــە جێگـــای بـــاوەڕە و جـــێی بـــەرزێتی

باســـی نـــاکرێ هـــەر لـــە هێرشـــی چـــەند دڕنـــدە و وەحشـــی‌یە
کاتـــێ جەرگـــەی شـــەو بەســـەرتا بـــۆت دەهێنـــێ هەڵمـــەتی

زۆڵ و کـــەم بـــێ نـــرخ و چـــاو شـــۆڕ ســـووك و بـــێ پایـــەو بـــەها
خـــۆ پەرســـت و دژ بەخـــەڵکی هـــەم دینـــاری دینیـــەتی

بـــیر بکـــا ناکـــا ئەمانـــە کێـــن وچـــین و چـــۆن دەبـــێ
کـــێ لەســـەر تەختـــە بـــەڵێ ئـــەو وەك ژن و نۆکەریـــەتی

تـــا بڵـــێ ئـــازاو بەجەرگـــــە بـــۆ ســـووتانی لاشـــەکەت
شـــین و پرســـەش نـــابێ دانێـــن چەشـــنی دەوری نـــەفرەتی

کـــام قســـەی بـــێ نـــرخ و ســـوك و ناڕەوایـــە پێـــك دەڵێـــن
باشـــە ســـەرداری کـــەوابێ ئـــەی لـــە کوێیـــە عـــیزەتی

ئـــەم لـــە ئـــەم زۆر زۆر بەداخـــەو ئـــەو لـــە ئـــەم زیـــاتر گـــەلێ
بوینـــە گورگـــی هـــارو برســـی میللـــەتیش نێچریـــەتی

هەرلـــە گچکـــە تـــاکو گـــەورە حـــاڵی بڕوانـــی پەشـــێو
والـــە دەســـتی دەســـت براکـــەی شـــین و دادو ڕۆیـــەتی

بـــەس پەلـــەی مۆدیلـــی قەســـرەو هـــەم ســـەیارەی دووهـــەزار
ســـەیری هـــەندێ خـــەونی خۆشـــی ڕاکـــە ڕاکـــەی جۆیـــەتی

مـــاڵ و خـــێزانی شـــەهیدیش وا لـــەکۆلان کـــەو تـــووە
دەربـــەدەر بـــێ کـــەس دەنـــاڵێ کـــێ دەڵـــێ هـــا یارمـــەتی

خواردنـــی خۆشـــی لـــەڕۆژی جەژنـــەدا بڕوانـــی گـــەر
نـــان کەپـــەك، مەنجـــەڵ بـــەتاڵ، لـــەو پـــەڕی حـــاڵی شـــڕیەتی

هاوبەشـــی خـــەمبار و ئـــازار نـــان کـــەری ئـــەو مـــاڵ و مـــاڵ
ئـــاگری گـــەرمی لەزســـتان یافســـە یـــا تڕیـــەتی

ڕووت ومنداڵــــــی لــــــەخاکا دەم چــــەقیوە بـــــۆرو پیــــــس
باشـــــە کـــــەنگین مـــــاف ڕەوایـــــە ئـــــەی چ ڕۆژە هیمـــــــەتی

دوای ســـــــوتان و مـــــاڵ وێــــــران و دەربــــــەدەر ئـــــەنفالی زۆر
باشـــە چیبـــــوو کـــــوا خــــەلاتیان ڕووت و برســـــی و نەگبـــــەتی

کۆرپـــــەکانی بـــــێ لەمـــــەیدان چەشـــــنی ئـــــاژەڵ پارەکــــــا
دەیفرۆشـــــی بـــــاوەڕت بـــــێ هیـــــچ نـــــەماوە دەرفــــــەتی

کـــــاری دڵســـــۆزی بـــــەکارە نـــــەك بــــــەدەم هــــــاوارو دەی
کۆمـــــەڵی شـــــاد بـــــۆ هـــــەژاریش تـــــف لــــەوەردو شــــۆیەتی

ســـــەوزو ســـــۆرو زەردو مـــــۆرو شـــــین ســـــبی تێکـــــڕا لـــــەڕەنگ
بـــــەرگی ڕەشپۆشــــــە لـــــەداخیان ئـــــاخ و ئـــــۆف ئۆیــــــەتی

دارو بـــــەردو شـــــاخ و کـــــانی دەشـــــت و لادێ و شـــــارەکان
هێنـــــدە بـــــێزارن لــــە ســــوتان ڕۆژ و شــــەو بــــۆن ســــۆیەتی

ئاسمـــــان گریـــــا لـــــە داخیـــــان لێی دەبـــــاری خوێن بـــــەخوڕ
بـــــاکی چیبـــــێ، مەســـــتە بۆخـــــۆی ، پێـــــك لەدەســـــت و دەمیـــــەتی

کـــــێ بـــــوو ئـــــەو کـــــارەی کەســـــازدا ئایـــــە ئاکـــــامی چ بـــــوو ؟
یـــــا ســـــزاکەی بـــــوو بەســـــەردار کـــــاکم هـــــەروەك خۆیـــــەتی

ڕوو ڕەشـــی پێشـــوی ڕژێمیـــان وا ســـپی کـــرد چـــوو لـــە یـــاد
هـــــەرچی زۆرداری ئـــــەوان بـــــوو دەســــــتی ئەمڕۆکرِیـــــەتی

پـــاك و دڵســـۆزو مرۆڤـــی ژیـــرو زانـــاش دڵ بـــە خـــەم
دەســـت بەئەژنۆیـــە بـــێزاری حـــاڵ و مـــاڵ و ژینیـــەتی

کێ‌یەحـــەدی، ڕەخنـــە بگـــرێ یـــا بچـــێ ســـەر هـــەڵگرێ
قـــوڕ بەســـەریا خـــاك بەســـەر بـــوو وا قـــەلاچوی تۆیـــەتی

ســـەختە چـــابێ بـــەس ئـــەوەندەش بـــاش بزانـــە کـــاتی یـــە
هـــەر دەبـــێ بـــڕژێ بەســـەریان چونکـــە گـــۆزە پڕیـــەتی

کێـــوە ڕاکـــەن هـــەر دەخنکێـــن بـــا بخـــۆن گۆشـــتی هـــەژار
ئـــەی کـــە بیرناکـــەن لەئێســـکی تیژیـــان پـــڕ قوڕگیـــەتی

میللـــەتی کـــورد زۆری دیـــوە ســـەخت و چـــەوتی و ڕۆژی ڕەش
کـــێ لەگـــەڵ گورگـــا لەبەزمـــە و بـــۆ مـــەڕیش کـــێ شـــینیەتی

بابئـــاڵێم مـــــن لـــــەتۆزی دوور ولآت زۆر خۆشـــــترە
پەرلـــەمان و مـــیری بـــۆ وان بۆمنیـــش بـــا غوربـــەتی

زۆر بـــە ووردی ســـەیری شـــیعرم حـــاڵی خۆتـــان کـــەن بلێـــن
خـــوات لەگـــەڵ دەرچـــووی لـــەداخی نارەواوخۆخۆیـــەتی

بەسـیە (پـاکی) تـۆ هەتاکـەی گفتوگـۆ بـۆ کـێ دەکـەی
کـورد لـەناو یـەك سووکە بـۆ یـەك کوانـێ ڕێـز کـوا قیمـەتی

پاکی
١٩٩٦/١/١

# من هەڵەم کرد

من هەڵەم کرد، ئێوە مەیکەن دۆستەکان هەی شێرینە
بەس بکەن چۆڵ و هەتیوکەن ئەم وڵاتە شیرینە

سەیری هەر بستێ لەهەر لای گەر بکەی دەڕوانی چەند
کەللە کاسەی نەمری قازی و شێخ حەفیدی دێرینە

گەر زمانی بوایە چەشنی شێری برسی دەی نەڕاند
شەرمە بێگانە پەرستی کەن بە ڕێچکەی ئەوژینە

سێبەری ژێر دارە پیرەی شاخە بەرزەی ها لەدوور
تەختی پاپای ڕۆم دەهێنێ و کۆشکی هەرچی لەو چینە

دۆی بەنانێ ڕەق بەدەستی شۆخێ ژێر ڕەشماڵی ڕەش
باوەڕت بێ سەد حەکیمی زامی قۆڵی بە برینە

بۆیە حەزناکەم بە داخ و خەم بڕۆن سەر نێنەوە
تاکو ڕسواو دین نەبن بۆ ئەم بەهەشتە ڕەنگینە

سەنگەری ڕووی کۆی نەیارن لاوی هێرش و هەڵمەتن
بۆلەتی سەر جەرگی دوژمن خەنجەری نوك تیژینە

مایـــەی شـــانازی هیـــوان بـــۆ پاشـــە ڕۆژی ئـــەم گەلـــە
هـــێزو پشـــت و تێـــن و بـــڕوان لاوی ڕونـــاك بیرینـــە

پاکی

١٩٩٩/٩/١٠

## باواجی

بۆنـــــی گـــــولێ وگوڵـــــزارو شـــــەوبۆو مێخـــــەك و حـــــاجی
بـــــەچی كـــــەلێم دیـــــار نـــــەبێ لوتكـــــەی ســـــەری بـــــاواجی

بەهەشـــــتی دوو جیهانـــــە ســـــەر كانیلـــــەو نـــــاو ڕەزان
هـــــەروەك زێـــــڕو بـــــەردی ڕەش وایـــــە پەیكـــــەری حـــــاجی

هەیبـــــەت ســـــوڵتان چنـــــارۆك بـــــۆ زام و دەرد پزیشـــــكە
زێـــــڕو ئـــــەڵماس و دوڕە چبكـــــەم نییـــــە ڕەواجـــــی

پـــــاریس و شـــــام و ڕۆمـــــی بـــــەقوربان ئـــــەو هـــــەر دەبـــــێ
پـــــڕ لەدرِكـــــە كـــــەڕاوچی هـــــەی هـــــا دەكـــــا لـــــە تـــــانجی

ســـــەر شـــــێتی یـــــە لەســـــۆزی باوەشـــــی دایـــــك ڕاكـــــەی
ســـــەنگی نـــــایێ بـــــە ســـــەنگی جیـــــهان و تـــــەخت و تـــــاجی

بـــــەلاّم بـــــەداخێ داغـــــم لەحەشـــــریش پـــــێی دەنـــــاڵم
خـــــاكی كـــــورد نـــــەبا بـــــەهای هـــــەوای دوڕ دەبـــــو بـــــاجی

ســـــواڵكەری خـــــاكی قـــــاپی دەرگـــــای بـــــاو پـــــیران كـــــەی
چـــــاترە نـــــەك لـــــە غوربـــــەتا بڵێـــــن لەســـــەر بورجـــــی عـــــاجی

ئەم پارچە هۆنراوەیە لە گۆڤاری بێوار بڵاوكراوەتەوە لە هۆڵەندا
٥ / ٥ / ١٩٩٥

# عومری كورتم

بـــا نـــەمێنێ زوو بەســـەرچێ عومـــری كورتـــی مـــن دەبـــا
بـــووم بـــە خـــەرمانی زەكـــات وكـــێ بـــێ بەشـــی خـــۆی دەبـــا

لـــەو هـــەموو دونیایـــە گـــەورە بـــۆ گرفتـــار مـــن دەبـــووم؟
گـــەر فەلـــەك حوكمـــی لەڕاســـتی تـــۆزە مســـقالێ هـــەبا

بابـــە گوڕگـــوڕ بـــوو ســـوتاندی گیـــانی مـــن ســـەرجەم ولآت
خۆزگـــە دڕك و لم دەبـــوو كـــۆی زێـــڕی ڕەش بـــۆ هـــەر نـــەبا

گـــەر هـــەوای بـــۆ دەرد حـــەكیم و بـــەردی زێـــر یـــاقووت نـــەبوو
ناحـــەزان بـــۆ وا لـــەدژمان یـــەك دەبـــوون و یـــەك تـــەبا

هـــەرچی دەردێ هـــات ڕەتـــاندم پێـــم نەوەســـتا یـــەك نـــەبێ!
ڕاكـــەی زۆڵـــی پێـــش ڕەقیـــب بـــوو هـــەروەكو دێـــرە بـــەبا

مـــاوە داخـــێ تـــر لـــەدڵما جـــەرگی ڕەش كـــردووم ئـــەویش
ڕێبـــەران بـــەس پێكـــی دەســـتی دوژمنانیـــان نۆشـــی بـــا

هـــەرچی نـــاكرێ پێـــم گەرەكمـــە و هـــەرچی دەكـــرێ پێـــم دژە
جەســـتە چبكـــا وەك كەپـــەك بـــۆ ژێـــر شـــەنەی بـــەر هـــێزی بـــا

پاكی
٢٠٠٢/١/١

# زۆڵە کورد

چیم لەدەست نایە لە داخی زۆڵە کورد گەر خەم نەبێ
بۆیە ئاسمان وابە ئاهی سەردی من پڕ تەم دەبێ

هەرکەسێ هات و وتی من گیانم بەختە بۆ وڵات
پێی بڵێ دڵسۆز ئەوانەن وەك چرای بەر دەم دەبێ

شەرمە گەنج و لاوی ئەمڕۆ ژیرو زۆر هۆشیار نەبن
تابەکەی دوای خۆ فرۆش و زۆڵ و پیاوی کەم دەبێ

هەرچی قەومێ هەی لەعالەم دژ بەیەك دواکەوتەیە
سوك و ریسوا دیل و بێ ماف بەش بەش و ماتەم دەبێ

واسەدەی بیستەم بەسەرچوو بەسیە تاکەی خۆ کوژی
سینە تاکەی دەست نیشانی تیری ئەوو ئەم دەبێ

ئێمە پێشبڕکێی نەزانی و خوێن ڕژانی یەك بکەین
دیارە ناکۆکیش کە ڕۆڵەی نابینای بەرهەم دەبێ

بیر بکەین چاکە هەتاکو پێش کەوین وەك دەوڵەتان
بۆ ئەمەش تەنها بەهۆی یەك بیروڕای سەر جەم دەبێ

بەختی ڕەش بۆ کورد نەبا گەر گەورەکان یەکیان دەگرت
نەك شەڕی دۆلارو کورسی کەی بۆیەك مەرهەم دەبێ؟

١٥/ ١٠/ ١٩٩٦

## شەرمەزارم[٣]

چیـــم لەلەنجـــەو نـــازو خـــەندە و عیشـــوەیە و مـــاچی دەمـــیێ
شـــەرمەزارم عەشـــقی شـــەم بـــووم، زوو لـــە پێشـــا ســـەردەمیێ

چونکـــە عەشـــق و ڕوح دەبـــێ بـــۆ ، بـــەرزی ئـــالآبێ خـــەلآت
ســـاکەوابێ بابـــە ســـووتان، شـــەو بەرۆژکـــەم بـــۆ گـــەلێ

شـــەرم و مەرگـــە ئـــەمڕۆ چـــەرخی ، بیســـت و یـــەك بـــێ میللـــەتم
دیـــل بـــژی ســـەر خـــاکێ خوێنـــاو، چـــاوی هەڵـــهێناوە لێ

ژیـــانێ کـــورت سەربەســـت گەرەکمـــە، ســـەرفراز وەك دەوڵـــەتان
ژیلـــەمۆی ڕێبـــازی شـــادیم تێنـــوی ئـــازادیم گـــەلێ

دەچمـــە نێـــو چـــاوی ڕەقیبـــان، بـــەگڕەوە گریـــان دەدەم
تابەســـەر شـــۆڕیان دەبینـــم، زەق لەمـــەیدان بـــۆی هـــەڵێ

قـــاپێ خوێـــن و یـــەك هەناســـەو، مســـتێ ئێســـکە جەســـتەکەم
چـــۆن دەلـــەرزم نامـــەوێ قـــەت، پـــێ‌ی نـــەوەم ئاســـۆی هـــەڵێ

هاوبەشـــی ژانـــی هـــەژارم، گـــەر نەکـــەم زۆڵ نیمـــە چیـــم؟؟
نابینـــابێ چاکـــە چـــاو نـــەك، قـــەل بکـــا پاســـی گوڵـــێ

---

(٣)ئەم پارچە هۆنراوەیە لە بێوار بلاو کراوەتەوە لە ساڵی ٢٠٠٢ .

نــەڕژێ مێشــــکی ســــەر نــــەبێ پــــان، زەق نــــەکۆڵن چـــاوێ ڕەش
خـــەندە ســــــەر لێــــوی شــــەهیدان، ناکـــــەوێ و نــــایێ بــــەڵێ

کـــوا بروســــکەی کێــــوە گرمـــەی، دەنگـــی مـــافی (پـــاکی)یـــە
دێ دەڵــــێ قـــەومێ نـــەژادی، بـــۆ ســـتەم کـــورد بڵـــێ

پاکی
٢٠٠١/٣/١

## گەرمە شینی هەڵەبجە[٤]

لەناو جەرگەی بەهارێکا، کەبینیم شین و ڕۆڕۆیە
بەلام شینێ بوو ئەمجارە، هەڵەبجە بەس لە بۆتۆیە

بلێم چی چی بدرکێنم، لەکوێ دەست پێبکەم چاکە؟
وەکو مەحشەر کە هەڵسابێ، دڵم یەك پارچە پشکۆیە

دەبا دەرچێ بینای چاوم ، لەپاش وەی دیم بەدوو چاوم
کەلاشەی نەو نەمام ڕێزبێ، لەلای گۆران هەتا کۆیە

قوڕ پێوان بوو گەرمە شین بوو، وەیشومێ بوو لەچوار لاوە
لەقامشلی تا دیاربکر، لەخانەقین هەتا شنۆیە

هەتا گیان بێ لە و دونیایە، بنووسم باسی ئەم حاڵە
بەڵێ وەك چم نەنوسیبێ، ئەوەندەم من لەدڵ کۆیە

لەهەر لایێ کە بڕوانی، هەموو ئەو خەڵکە وەك خەوتوو
سوتاو برژاو ڕەش داگەڕاو، هەموو خەڵوز و بۆن سۆیە

وەك لەباوەش فریشتەبێ، هەمووی نوری لێ نیشتبێ
ڕۆڵەو باوك کۆڕپەو دایك، بەجووت دەست لەملی خۆخۆیە

---

([٤]) ئەم هۆنراوە بە شێکی لە بێوار بڵاو کراوەتەوە ژمارەی ٥٦ ساڵی ٢٠٠١ دراوەتێ لە ئادار، کە بەبۆنەی کیمیا بارانی هەڵەبجە بەدەست رژێمی بەعسی درندەی دکتاتۆر .

لــــەگوڵزارا دەپرســــی گــــەر، مــــەلول و مــــات و خامۆشــــە
نەســـۆزی چەهچـــەی بولبـــول، نـــەنێرگز هـــەی نەشـــەوبۆیە

هـــەموو ســـەوزایی جـــەرگی ڕەش، لـــەڕوو زەردی وەکـــو پـــایز
نـــەمامی بـــاغی ئەوســـاڵمان، نـــەهات و بـــێ لـــق و پۆیـــە

لـــەماوەی چـــەند دەم و ســـاتێ، وەکـــو وێـــران بـــێ ئـــەم نـــاوە
بـــەڵام ڕۆن بـــوو بـــۆ ئـــازادی، ســـەری قوربـــانی وەك گۆیـــە

بـــەدی و تـــاوانی ئـــەم خەڵکـــە، چ بـــوو بـــۆ وای بەســـەردابێ؟
خـــەڵاتی جەژنـــەی ســـێدارە، قـــەنارەو پـــەت لـــە ئەســـتۆ یـــە

کـــە دوو چـــاوی هـــەڵێنا کـــورد، بـــەگۆمی خوێـــن و ئـــەنفال بـــوو
کـــەچی بۆمـــان نـــەماندی کـــەس ببینـــین دەســـت بـــە ئـــەژنۆ یـــە

لـــەژێر یاســـای کـــەبێ یاســـای، گـــلاوا ئێمـــە تاســـاوین
ئایـــە بـــۆ کـــورد نی‌یـــە یاســـا، یـــا لەڕاســـتی گشـــت درۆیـــە

هـــەموو بـــەد بـــەختی خۆمانـــە، لەگۆشـــەی خـــەم بـــێ نـــاز مـــاوین
دەنـــا بـــۆ تـــیری نـــاکۆکی، ڕووی لـــە جـــەرگی مـــن و تـــۆ یـــە؟

هـــەموو ســـەد ئاســـن و پـــۆلان، لـــەدژ یـــەك ڕووبـــەڕووی یـــەکتر
کـــەچی بـــۆ ناحـــەزیش دڵتـــان، وەك چۆلەکـــەی دەســـتەمۆیە

چتـــان کـــرد هـــەی وەفـــاداران، بـــەناوی مـــاف و چـــارەی کـــورد؟
یـــا گوڵتـــان چـــاند بەنـــەمامی، تـــازە پۆخـــی وەك چـــرۆ یـــــە؟

زڕا ناومـــان و ڕیســـوا بووین، هـــەموو عالـــەم دەڵـــێ پێمـــان
بـــۆ کاروانتـــان ناگـــا کـــەچی ، بـــەرۆژ دەرواو هـــەم شـــەو ڕۆیـــە

هـــەموو ســـوار ئەســـپی تیـــژڕۆن و بـــۆ ئـــازادی کـــە تـــاو نـــادەن
بەمـــەش ڕۆنـــە کـــەهیواتان، پـــول و کورســـی و چـــاوو برۆیـــە

کـــەمێ بیرکـــەن بـــدەن ئـــاورێ، لـــەڕووی ناســـۆری ئـــەم خەڵکـــە
ببینـــن شـــارو دێـــهاتتان، کـــە چـــۆن خـــاپورو نەغرۆیـــە

هەتاکـــەنگین لەســـەر پێـــن بـــۆ، ڕوخـــان و کۆشـــکی شـــادی کـــورد
بۆیـــە ناکـــەس وا لەســـەرمان، بۆتـــە شـــێرو وەك هەڵۆیـــە

بەســـە تاکـــەی هـــەڵمان دێـــرن، بەشـــاخ و بـــەرزو هـــەورازا
بۆیـــە حاڵمـــان پەرێشـــان و، چـــوار دەورمـــان گەمارۆیـــە

ئـــەبێ کـــەی بـــێ لـــەژێر هـــەوری، ڕەشـــا دەرچـــێ دووچـــاوی کـــورد
بەســـە توخـــوا جـــەفاو ئـــازار، نـــەخوا فـــەرمووی نەتاپۆیـــە

زۆرە داخ و خـــەمی ئێـــوە، نیـــیە پارســـەنگێ شـــك نابـــەم
هـــەبێ ســـەد ســـەنگی وەك کێـــوی، بەقـــەد بـــاواجی و ئاکۆیـــە

دەبا ڕەشماڵی پڕ شادی، هەموو هەڵدەین لەسەر خۆمان
زەمانێکە شەهیدانمان، هیواو چاویان لەئەمڕۆیە

دەبا تێکڕا لەسەر لوتکەی، شاخی بەرزی سەر هەڵەبجە
بچریکێنین بڵێن مـوژدە، ئۆخەی وڵات سەربەخۆ یە

ئیلاهی ئاخ لەدەست چەرخی، ڕەشی سەختی تیا ماوین
هەتا کەنگین خوێنی هەژار، لەناو کاسەو بۆ گرۆ یە.

پاکی
نەورۆزی ١٩٩٨

## چریکەی کورد[٥]

دێ چریکـــەی کـــورد لەشـــارو دەشـــت و کێـــو دێهاتـــەوە
مژدەیـــی نـــەورۆز دەدەن بـــۆ خـــاکی پـــاکی وڵاتـــەوە

بـــەس دەکـــات هـــاوار لەســـەر کێـــو ، گـــڕ بەتایـــەو دار نی‌یـــە
کەللـــە کاســـەی لاوە ئەمســـاڵ ، گـــڕ بـــەجۆش خـــۆش کاتـــەوە

گیـــانی ســـەربەرزی ، لەبـــەرزی خســـتە ژێـــر پـــای خـــۆی بـــەکۆ
بـــۆ ڕزگـــاری میللـــەتێکی ، مـــاف خـــورای گشـــت کاتـــەوە

بـــەندو پـــەت زنجـــیر براکـــەی ، پشـــتی مانـــە هـــەر لـــە بـــوون
تـــا خۆڕاگـــر بـــین بـــۆ ڕۆژێ ، نەگبـــەتی و هەیهاتـــەوە

زیندەچـــاڵ ئـــەنفال و کیمیـــا ، زەق لەمـــەیداندا دەڵـــێ
خۆشـــکەری ڕێگـــەی خـــەباتین ، بـــۆ هیـــواو ئاواتـــەوە

ئێمـــە خـــۆش بـــەختین بـــە ســـووتان ، جەســـتەمان شـــەم لالـــە بـــێ
دەنـــگ بـــدا تـــا هـــێز نی‌یـــە کـــوا ، مـــافی کـــورد بـــیر باتـــەوە

نـــامرین وەك ســـاڵەکانین ، بـــەردەوام هـــەر ســـوور دەدەیـــن
تـــا لـــە ژێـــر تـــاریکی ئاســـۆی ، کـــورد دەڵێـــن هەڵهاتـــەوە

(٥) ئەم هۆنراوەیە لە بێوار بلاو کراوەتەوە ژمارە (٦٨) لە مارتی ٢٠٠٢ لە ڕۆتردام .

ژێــــره هـــەر پـــاڵ بـــەردو شـــاخێ، کـــاوه ســـەرپێ هـــا لـــــەوێ
بـــۆ ئـــەوەی کـــێ مـــافی خـــواردووە، مـــاوە ســـەرپان کاتـــەوە

(پـــاکی) بـــێ خـــەم بـــە لـــەکورد، کـــورد، تـــازە حـــاڵی حـــاڵی بـــوو
کـــۆی نـــەیار ڕووی ڕەش دەبـــێ ڕووی، مـــەرجێ خـــۆی یـــەك خاتـــەوە

پاکی
١٢ / ٧ / ١٩٨٩

## دێمەوە

ئۆقـــــره نـــــاگرم دێمـــــەوە هەردێمـــــەوە
مـــین و ئـــاگریش بـــێ ئەگـــەر تێکـــڕا هـــەمووی ســـەر ڕێمـــەوە

کورتـــە عومـــرێ چەشـــنی چـــەند دێـــر ســـەرپەڕی ڕووی ڕۆژگـــار
زۆر لەســـــەرخۆ کـــــاڵ دەبم تـــــا تـــــاوێ دێ دەســـــڕێمەوە

چـــۆن لـــە خاکـــا بـــووم دەبـــێ هـــەر ڕوو بـــەخاکیش چـــم دەبـــێ
ســـا هـــەتا مـــام بـــۆ بـــەمردوو بابـــەپیری خـــۆم بێمـــەوە

بویـــە شـــەم شـــەم مـــن لـــەژوری جۆشـــی ئـــاگری گیـــان دەدەم
پرتەپرتمـــە بـــۆ وەلامیـــش خـــۆم بـــەخۆم دەدوێمـــەوە

ســـوێند بـــەگۆڕی بـــێ ســـنووری پـــاك شـــەهیدانی وەتـــەن
دڵ وێـــران و کاولـــە هـــەروەك شـــارو گونـــدو دێمـــەوە

بـــەردەوام گـــڕ هابـــە گیـــانم بـــەس بـــە ڕۆژ وەك مـــانگ ونـــە
دڵ ســـوتاو وەك بـــەردە ئەســـتێ تێـــم دەگـــا گـــڕ پێمـــەوە

کـــەس نی یـــە بمکـــا بـــە دەنکـــێ حـــەب لـــە نێـــو پـــەرداغێ ئـــاو
تـــابیبنێ پێـــش کـــە دەتوێـــم مـــن چلـــۆن دەکزێمـــەوە

ژیانـــە کـــەی خۆزگـــەم بـــەدوێنێ ئـــەمڕۆ ئەمســـاڵ یـــا بـــەپار
بویـــە ئاغـــەی خـــەم بـــەزامی کـــۆن و نـــوێ دەڕزێمـــەوە

بۆتـــە بەرنامـــەی ژیـــانم خـــەم پـــەژارەو حەســـرەتی
چەشـــنی مـــەزراح خـــول بـــەدەوری خـــۆم دەدەم دەخولێمـــەوە

چـاوەڕێی مـەرگی لەسـەر خـۆی خـۆم دەكـەم بـێ دەنـگ و مـات
تـــاكو ســـاتێ دێ لـــەناكاو بـــۆی دەڕۆم ســـەرنێمەوە

دیـم قومـارچی دوێنـــی دۆڕا ژیـا بـە هیـوا بـۆ سـبەی
جۆكـەری مـن مەرگـە نابـەم شـك بـە هیـچ تـێ بێمـەوە

بێتـــو سەرپشـــكم لـــە نێـــوان دۆزەخ و غوربـــەت بكـــەن
بـاوەڕت بـێ خۆشـە گیـان دان بـۆی لەسـەر یـەك پێمـەوە

بۆیـە هیـوام ڕۆژێ ڕاكـەم ڕوو بـە خـانووە بـە قورەكـان
مـاچ و بۆنیـان تـێر بكـەم زۆر تابـەهۆش خـۆم دێمـەوە

تـــۆزە وردەی قاپیـــەكانیان هـــەروەكو ســـاوای بەمـــەم
یـــەك بەیـــەك بـــەزمانی برســـیم بیمـــژم بـــی لێســـمەوە

بیكەمـە میحـراب و ڕوگـەم بـۆی بەسـەر كڕنـوش بـەرم
بیمـــە قوربـــان دركـــە زەردەی تیـــژ دەچەقتـــە پێمـــەوە

فـڕێی بـدەم گۆچـانی دەسـت و كۆنـە چاویلكـەی قـەدیم
چـــۆن بلێـــم پـــیرم كـــەلاوم تـــازە مـــن دەژێمـــەوە

دەسـت لـەمل ئـەحباب و دۆسـت و خـزم و خوێـش و كـار دەكـەم
هـەرچی جـاری دیومـە سـەدجار مـن بەسـەریا دێمـەوە

چیــم لــە کۆشــکی واشــنتون و بــاغی ڕۆم شــاری گوڵــە[٦]
کــۆی بــەقوربان قاسـپەی کــەو دوور دەنگــی هــا بــە گوێمــەوە

ئەلقــە زێــڕەی دەســکی دەرگــای بیانیــەکان قوربــان دەکــەم
بــەو پەتــە ڕزیــەی بــە قــاپی کــۆزی بــەرخی دێمــەوە

نامــەوێ پێنووســی دەســتی شــا بــەڵێن ژێــر پــێی دەکــەم
بــەو ســیخارەی ژێــرە کــەپرێ دڵنیــام دەی پێچمــەوە

ئــەو شــنەی لای‌لای بەبســکی شــۆڕەبی و ڕووی زەرد دەکــا
کــۆی شــیفای ئازارەکانمــە کــاتێ بــۆی مــن ڕێمــەوە

هــەرچی دەبیینــم دڵــم پــێی تونــدە بــۆ چــاو تانەیــە
خــۆم غــەریب و گۆڕغــەریب بــۆ نێــو غــەریب ســەرنێمەوە

(پــاکی) یــە بــێ کــەس کــە کوشــتەی دەردی ســێ لایــەو دەڵــێ
دەســت ڕەقیــب ، غوربــەت ، بــرای پشــت تابەکەی‌دەبڕێمــەوە

پاکی
١٥ / ١١ / ١٩٩٨

---

(٦) واتە هۆڵەندا کە بە وولاتی گوڵ بەناوبانگە.

## گوێی جیهان
## شەش خشتەکی شیعری پاکی

ئــــەی ئەوانـــەی بـــۆ هـــەژاران، هـــەر لــــەباس و گفتـــــو گـــــۆن
تابەکـــەی وەك گورگـــــی هـــارو، برســــی جـــەرگی یـــەك دەخـــۆن
مــــاف و راســــتی کـــــوا لەڕاســــتی، نـــەبووە قـــەت هـــەردوو درۆن
گـــــەر دەڵێــــن وەك داری دەســــتە، تـــاکو خۆتـــان پــــێی بـــڕۆن
تـــا بەکــــەینێ دژ بەویســـــت و، خواســـــت و هیـــوای گـــەل دەڕۆن
شــێت و شـــەیدای قیبلـــە بـــەس کـــەن، خلّـــدن و مـــارك و کـــڕۆن

*** ***

ڕۆژو شـــــەو هـــــەردەم، لـــــەبیری کوشـــــتنی ئـــــەم یائـــــەون
دوژمنــــن بــــۆ یـــــەك هـــەموو دەم، لێـــك دەدەن چەشـــنی کــــــەون
تابەکـــەی وەك کوێـــــر شـــــوفێری، ســـــەختی تـــاریکی شـــەون
دوورە ئـــــازادی وەهــــابێ، یـــــا خەیاڵــــــەو هـــــەر خـــــەون
ســـەخت و قورســـــە بـــاری میللــــەت، ئـــەی ئەوانـــەی پێشـــڕەون
بـــەس پێداکــــەن تــۆی لـــەدژ یـــەك، هـــەر خـــەریکی وەردو شـــۆن

*** ***

گـوێی جیـهان پـڕ بـوو لەباسـی، یـەك نـەبوون و خوێـن ڕژان
هـەر لەسـایەی حوکمـی ئێـوە، زۆر بـوو برسـی و دەردو ژان
بـاوك و ڕۆڵـە و دوو بـرای یـەك، ڕاپـەرین و لێـك قـژان
ئاسمـان سـور بـوو لـەداختان، کێوەکـان هاتنـە هـەژان
سـوك و ڕیسـوا بویـن بەپـەند بـۆ، ناکـەس و دۆسـت و دژان
ئـاوی بـیری دەرزیمـان دی، ئێـوە هـەر لـە هەشـت و نـۆن

*** ***

تابەکـەی عـودە لـە گۆیتـان، شـین و گریـەو نـالّی کـورد
چـۆن بینـایی چاوەکانتـان، دانـەهات بـۆ حـالّی کـورد
تـیر نـەبوون تاکـەی لـە هـەولّن، بـۆ شـکانی بـالّی کـورد
شـەرم و مەرگـە بەسـیە چیـتر، مەبنـە بـاوك و خـالّی کـورد
چـۆن بلێـم پـیرۆزە لێتـان، جـەژنی تـازەی سـالّی کـورد
بـەس بـێ پـەیمانی درۆتـان، ڕاکەنـە پـاریس و بـۆن

*** ***

مـاچ و سـوێند و دەسـت لـە ملتـان، وەك فەلـەك هـەر ڕێوەبـوو
کـام شـەڕو داوو پیلانتـان، جـەرگی ئێـوەی پێوەبـوو
کـوا بـەری وەعـدو وەفاتـان، بـێ درۆ چـی پێـوە بـوو
شـەرمە بـەس باسـی زوحـاك، کـەن، کـوا زوحـاك وەك ئێـوە بـوو
یازەمینـەی پـول و کورسـی، سـوودی تیـا بـەو شـێوە بـوو
سـەیرە شـەو پاسـی ڕەقیـب و ، ڕۆژ وەکـو ڕۆسـتەم دەرۆن

*** ***

بــــەس لەســــــەر ســـــینەی کەڕامــــەت، دوژمنـــــان لای‌لایەکـــــەن
بـــــەس موتوربـــــەی زامـــــەکان و، کۆنـــــەکا بـــــەو بایەکـــــەن
بـــــەس بـــــە ڤـــــالیۆمی جەهالـــــەت، خۆکـــــوژی تاتایەکـــــەن
بـــــەس بـــــەبێ بـــــاوکی وەتـــــەنتان، ئـــــەم هـــــەموو ســـــەودایەکەن
ڕێ بـــــەری قـــــازی و حـــــەفید بـــــن، تـــــف لـــــە پـــــول و پایەکـــــەن
نـــــامرن چـــــۆن دەوری مـــــێزی، ناحـــــەزان دژ یـــــەك کـــــەکۆن

*** ***

چەرخـــــە کـــــۆن چاکتـــــان دەناســـــێ، شـــــین بـــــەدڵ بـــــۆ کـــــێ دەکـــــەن
چـــــۆن بـــــۆ تـــــاریکی ڕێگاتـــــان، ئـــــەم هـــــەژارە پـــــێ دەکـــــەن
چـــــۆن ولآتتـــــان بـــــۆ دۆلاری، دیـــــل وبـــــەند ژێـــــر پـــــێ دەکـــــەن
چـــــۆن کەمەســـــتی پێکـــــی دەســـــتی، دوژمنـــــن هـــــەرتێ دەکـــــەن
تابەکـــــەی دوای ئەســـــپی سەرشـــــێت، گەرمـــــە قۆشمـــــەو ڕێ دەکـــــەن
تابەکـــــەینێ بـــــۆ نـــــەیاران، وەك غـــــولام نـــــەرم و پـــــەڕۆن

پاکی
٦ / ٦ / ١٩٩٦

# ئەبێ تاکەی

ئەبێ تاکەی هەر شمشێری
تیژی دەستی بێگانە بین
ئەبێ تاکەی سوك و ڕیسواو
هەر دواکەوتەی زەمانە بین
ئەبێ تاکەی دەربەدەرو
ڕووت و برسی و دێوانە بین
ئەبێ تاکەی بەفوی دوژمن
هەستین هەروەك هەمبانە بین

**********

ئەبێ تاکەی وشیار نەبین
سوود وەرنەگرین لە ڕابردوو
ئەبێ تاکەی کەڵە پیاوی
ژیر دابنێین وەکو مردوو
ئەبێ تاکەی قەت بیر نەکەین
تا یەکگرین ئێمە هەموو
ئەبێ تاکەی هەرشەیدا بین
بەدوای پول و خاڵی لە ڕوو

**********

ئەبێ تاکەی باخچەی شەهید
هەر بێ مایە و بێ بەرهەم بێ
ئەبێ تاکەی زامی قوڵمان
بێ هەتوان و بێ مەرهەم بێ
ئەبێ تاکەی جەژنەکانمان
داد و شین و هەر ماتەم بێ
ئەبێ تاکەی خاکی بەهەشت
هەردۆزەخ و جەهەنەم بێ

**********

ئەبێ تاکەی بۆ هەژاران
بگرە و بەردەو ئەم ڕاوەکەین
ئەبێ تاکەی بازرگانی
هەربەخوێنی ئەم لاوە کەین
ئەبێ تاکەی هەر مل کەچ و
چاوە چاوی بەرماوە کەین
ئەبێ تاکەی تەفرەی مانی
ئەم سێبەر و هەتاوە کەین

**********

ئەبێ تاکەی لالەو نەسرین
بەلاو زیندە چاڵی گۆڕبێ
ئەبێ تاکەی شینمان بۆ یەك
هەر وەك درۆی گەورەی کۆڕبێ
ئەبێ تاکەی جڵەوی ئەسپ
بۆ ئازادی شل و شۆڕ بێ
ئەبێ تاکەی زاناو ژیرمان
مل بە داوی هەزار تۆڕ بێ

**********

ئەبێ تاکەی خاك دەرنییەکا
چرۆی ئازادی و سەربەستی
ئەبێ تاکەی لەژێر پێ کەین
هیوای گەل و ڕاز و ویستی
تاکەی باوەش بە یەکا کەین
بەدرۆ توند بۆ خۆشەویستی
تاکەی هیوای گڵاوی دوژمن
ژێرگۆڕ نەکەین هەم مەبەستی

**********

تاکەی دەبێ خۆ نەناسین
لە جیهانا کە ناسراوین
تاکەی دەبێ وانە زانین
لەیەك بۆ سەد بەشکراوین
تاکەی دەبێ بێ باوەڕ بین
کە خاوەنی خاك و ئاوین
تاکەی دەبێ گاڵتە بەیەك
بکەین وەك یەك جەرگ بڕاوین

**********

ئەبێ تاکەی لەمەیدانا
بەرامبەر یەك وەك پۆڵا بین
ئەبێ تاکەی بەڕووی خۆمان
لەفێڵ و داو لەگۆڵا بین
ئەبێ تاکەی بەبێ وەستان
هەرخەم کێشی لە کۆڵا بین
ئەبێ تاکەی هەر لە سوڕی
گێژی گۆماوی قۆڵا بین

**********

ئـــــــەبێ تاکـــــــەی دواکەوتـــــــە بـــــــین
لـــــــە کـــــــاروانی ئـــــــازادی گـــــــەل
ئـــــــەبێ تاکـــــــەی خۆمـــــــان دانێـــــــین
وەهـــــــا لاواز وەك کوێـــــــر و شـــــــەل
ئـــــــەبێ تاکـــــــەی لەســـــــەر خۆمـــــــان
هـــــــەردەم بفرێـــــــن هـــــــەروەك و قـــــــەل
ئـــــــەبێ تاکـــــــەی بـــــــێ بـــــــەهابێ
لامـــــــان پـــــــەیمان یـــــــا مـــــــەرج و هـــــــەل

**********

ئـــــــەبێ تاکـــــــەی لـــــــەژێرمان زێـــــــر
کـــــــەچی ڕووت و بـــــــێ کراســـــــین
ئـــــــەبێ تاکـــــــەی خۆمـــــــان شـــــــێر بـــــــین
کـــــــەچی بـــــــۆ ڕێـــــــوی لـــــــە پاســـــــین
ئـــــــەبێ تاکـــــــەی خۆمـــــــان هـــــــێز بـــــــین
کـــــــەچی خۆمـــــــان هـــــــەر ناناســـــــین
ئـــــــەبێ تاکـــــــەی شـــــــەرم نەکـــــــەین
هـــــــەردەم لـــــــە دەســـــــت یـــــــەکێ تاســـــــین

**********

تاکـــــــەی بـــــــراو لەیــــــــەك نەگـــــــەین
هـــــــەر ســـــــەنگەرمان شـــــاخ و یـــــاڵ بـــــێ
تاکـــــــەی بەدەســــــــــــت ڕووی یـــــــــەکتری
جەســـــــــته خـــــــــواردەی قـــــــەڵ و داڵ بـــــــێ
تاکــــــــەی بەســــــــەر خوێنــــــــــی هـــــــــەژار
شمشـــــــــــێری نـــــــــــــارەوا زاڵ بـــــــــــێ
تاکـــــــەی مـــــــاف و ڕاســــــــتی دەبـــــــێ
وەکـــــــو یوســــــــف لــــــــەناو چـــــــاڵ بـــــــێ

**********

تاکــــــــەی دەبــــــــێ دوای چـــــــەند ســـــــەدە
دۆســــــــت و ناحــــــــەز قــــــــەت نەناســـــــین
تاکـــــــەی دەبـــــــێ ســـــــوك وەك قەســــــاب
جەســــــــتەی یــــــــەکتر زەق هەڵواســــــــین
تاکـــــــەی هـــــــەروەك بـــــــووك و خەســــــوو
بـــــــەم و بـــــــەوا لـــــــە قســـــــەو باســـــــین
تاکـــــــەی لـــــــەناو دەســــــــتی ڕەقیـــــــب
دەمــــــــێ ڕوا بــــــــین دەمــــــــێ ئاســــــــین

**********

تاکـــــەی ســـــروودی ئـــــەی ڕەقیـــــب بـــــۆ
بەیـــــــەك گیـــــان و یـــــــەك دڵ نـــــــەڵێین
تاکــــــــــــەی وەڵام بەیـــــــــــــەك دژی و
بـــــۆ ناحـــــەزیش هـــــەر لـــــە بـــــەڵێین
تاکـــــەی ڕۆژمـــــان لـــــەلا شـــــەو بـــــێ
تاکـــــەی شـــــەو بـــــێ بـــــە ڕۆژ بڵێـــــین
تاکـــــەی مـــــانگی شـــــەوە زەنـــــگ بـــــین
لـــــەبۆ ســـــوودی دوژمـــــن هـــــەڵێین

**********

تاکـــــەی مـــــوژدە بەکـــــەر بدەیـــــن
بـــــۆ کوێـــــر ســـــەما کـــــەین هـــــەڵ پـــــەڕین
تاکـــــەی ئـــــەوەی هیوامـــــان بێـــــت
وڵات هـــــەراج کـــــەین بـــــۆ کڕیـــــن
تاکـــــەی وێـــــژەی پـــــڕ هونـــــەرمان
تـــــالان و کوشـــــتن ســـــەربڕین
تاکـــــەی بـــــەری نـــــەبێ خـــــەبات
ئـــــەنفال و کیمیـــــاو ڕاپـــــەڕین

**********

بــــــــەهار تاکـــــــــەی لــــــــە ڕووی بـــــــــەهار
دەبــــــــــــێ ڕووی ماتـــــــــــەم و زەرد بــــــــــــێ
تاکــــــــەی ناکـــــــــەس لەســــــــەر کورســـــــــی
هیـــــچ بەدەســــــت بـــــێ ئـــــەوەی مــــــەرد بـــــێ
تاکـــــــــــــەی گــــــــــــەورەو ڕێبـــــــــــــەرەکان
دڵیـــــــان لەئاســــــــت میللـــــــەت بـــــــەرد بـــــێ
تاکـــــــــەی ســـــــــەوز و ســــــــۆر و شــــــــین و
زەرد و مـــــــــــۆر کـــــــــــــۆی وەك و دەرد بـــــــــــێ
**********
ئـــــــەبێ تاکــــــــەی هـــــــەر لــــــــە هـــــــەوڵی
بـــــــــــەرژەوەندی تایبـــــــــــــــەتی بـــــــــــین
ئـــــــــەبێ تاکـــــــــەی هــــــــەر مێوانـــــــــــی
دەرد و خـــــــــــەم و مەینـــــــــــــەتی بـــــــــــین
ئـــــــەبێ تاکــــــــەی هـــــــەر بــــــــە شــــــاڵی
وابــــــــوو واچـــــــووی ڕەحمـــــــــەتی بـــــــــین
ئـــــــەبێ تاکـــــــــەی هــــــــەر دەســـــــــتخەڕۆی
تـــــــورك و فــــــارس و پــــــێ پـــــــەتی بـــــــین
**********

٢٠ ئادار ١٩٩٦

# دەبا ئێمەش

دەبا ئێمەش سوێندمان ببێ
بە قەندیل و کێوی ئاکۆ
دەبا ئێمەش لەخۆین دەرکەین
ڕق و کینە و جەنگی ناوخۆ
دەبا ئێمەش کەمێ بیرکەین
بۆ ڕزگاری و لوتکەی ئاسۆ
دەبا ئێمەش بۆسەری یەك
بەس زوحاك بین بەس هۆلاکۆ

**********

دەبا ئێمەش ماف و یاسا
پێ شێل نەکەین لەمەو دواوە
دەبا ئێمەش بە نەفرەت کەین
خۆ کوژی وەك بەفری تواوە
دەبا ئێمەش پشتی یەك بین
بلێن داری خۆشی ڕواوە
دەبا ئێمەش پاسەوان بین
بەرامبەر ئەم خاك و ئاوە

**********

دەبا ئێمەش وەك دەوڵەتان
دەنگ پێشڕەوکا بۆ ڕابەری
دەبا ئێمەش زامەکانمان
بەهۆی ژێربێ چارەسەری
دەبا ئێمەش لە نەمامی
خەبات تاوێ بخۆین بەری
دەبا ئێمەش لەجەژنەکان
منالّمان شادو هەڵ پەڕی

**********

دەبا ئێمەش بەس لەسەر پێ
جەنگی پول و خۆڕایی کەین
دەبا ئێمەش بەس بێ میللەت
توشی دەردی ڕیسوایی کەین
دەبا ئێمەش تاوێ هەولێ
ئاشتی و برایی و تەبایی کەین
دەبا ئێمەش بەس تاوان و
گوشاری ناڕەوایی کەین

**********

دەبا ئێمەش بەکۆ بناسرێین
لە ڕووی ئەمڕۆی چەرخی ڕۆژگار
دەبا ئێمەش سەرفراز و
لەدەست دوژمن ببین ڕزگار
دەبا ئێمەش هەموو پشت بین
بەکۆ نەفرەت کەین لە زۆردار
دەبا ئێمەش بەس هەوڵ دەین
تەنها بۆ گەورەیی و سەردار

**********

دەبا ئێمەش بۆ ئازادی
بولبولێکی ناو گوڵزار بین
دەبا ئێمەش بۆ ئازاری
یەکا هەردەم لە ئازار بین
دەبا ئێمەش قەڵغانی ڕووی
نوکی تیری دەست زۆردار بین
دەبا ئێمەش لە ڕووی ڕەشی
نەیارانی کەم بێزار بین

**********

دەبا ئێمەش شکاوی دەستمان
بەس بەخواری بەستینەوە
دەبا ئێمەش لەو گلاّنەی
کەتێکەوتین هەستینەوە
دەبا ئێمەش قۆڵتی دەرگەی
ڕێی ئازادی پەستینەوە
دەبا ئێمەش بۆ هەڵەی زوو
چاو لە ڕووی یەك بەستینەوە

**********

دەبا ئێمەش هەنگاو بنێین
بەرەو بیری ڕوناکبیری
دەبا ئێمەش پێش برکێ کەین
بۆ پێشکەوتن بەهۆی ژیری
دەبا ئێمەش محەك دانێین
بۆ سەنگ و تای کوڕی میری
دەبا ئێمەش بۆ هەر خاڵێ
نەبەین دەستمان لە بۆ شیری

**********

**پاکی**

٩ / ١٠ / ١٩٩٠

## لوولەی تفەنگ[٧]

مەبەســـــتە گـــــەر بزانــــی بـــــۆ دڵـــــم پەســـــت و تەنگـــــە
مـــــات و غـــــەمبارم بۆچـــــی زمـــــانم لاڵ و لەنگـــــە

لـــــە گـــــۆڕا قـــــەت نـــــەگۆڕا ئـــــازار هەمیشـــــە برامـــــە
وەك دەریاچـــــە پـــــەژارەم لـــــە قـــــەبری دلاْ پەنگـــــە

وێنـــــەی جارانـــــە گورگـــــە بەچکـــــە گورگـــــە ســـــەردارم
هـــــەروەك ڕێـــــوی خـــــاوەنی هـــــەزاران فێـــــل و دەنگـــــە

وەك بـــــالْندە یارمـــــەتی و راســـــتی فـــــڕی بـــــاری کـــــرد
پڕبـــــوو لـــــە جـــــەردەو ڕێگـــــر ئـــــاژاوەو زەبـــــرو زەنگـــــە

شـــــادی نـــــەما توایـــــەوە ناخۆشـــــی هاتـــــە جێگـــــای
خـــــەوو خـــــواردن، دانیشـــــتن هەســـــتەو بـــــڕۆ هـــــەر جەنگـــــە

ئاســـــایش و هـــــەڵ پـــــەرکێ بـــــەزم و شـــــادی و موســـــیقا
بـــــوو بـــــە دەنگـــــی ئـــــارپێچی و تـــــۆپ و تەقـــــەی تفەنگـــــە

بـــــۆ هـــــاوار و دادی یـــــەك بـــــێ کـــــەس لـــــە کـــــەس ناپرســـــێ
هەریـــــەك باغـــــەل پـــــڕ دەکـــــا پـــــەیدابێ چـــــۆن بـــــەو ڕەنگـــــە

---

(٧) ئەم پارچە هۆنراوەیە لە ئازاری (١٩٩٢) دانراوە بۆ هۆی تێکەڵ بوونی حزبەکان بە ناڕێکی وە ئـەو کاتە (بەرەیان) پێ دەوت.

دڵســـــۆزی کەمـــــە تـــــابڵێ‌ی هــــەر راوی ســـــەرو ماڵـــــە
کـــــوڕی ڕۆژە هەردەمـــــەی هـــــەزاران جـــــۆرو رەنگـــــە

هـــــەرچی دور لـــــە راســـــتی‌یە ئـــــەمڕۆ یاســـــاو زانســـــتە
بـــــەخوێنی ئـــــەم هـــــەزارە تێرنـــــابێ وەك نەهەنگـــــە

زۆڵـــــە کـــــوردی دوێنێکـــــە شـــــادە ئـــــەمڕۆ وەك دوێنـــــێ
جـــــێ‌ی متمانـــــەو بـــــاوەڕە بـــــە هـــــێزو نـــــرخ و ســـــەنگە

هـــــەموو بـــــە دوای لـــــە راون بـــــۆ راکێشـــــە بـــــە لای خـــــۆی
وەك قارەمانـــــە خـــــاوەن چـــــەند داســـــتان و فەرهەنگـــــە

هێنـــــدە وا تێـــــك ئـــــالاون ســـــەختە لـــــە یـــــەك بینـــــەوە
شـــان لـــە شـــانی یـــەك دەســـون هـــەر دەڵـــێ‌ی شـــانەی هەنگـــە

زانـــای بـــەد بـــەختیش چبکـــا هـــاواری ناگـــا بـــە کـــەس
جـــــەرگی وەك بنـــــی قـــــازان وەهـــــا رەش و بەژەنگـــــە

بـــــەردی خســـــتۆتە ســـــەر زگ برســـــیەتی تاکـــــەم بکـــــا
بـــۆ نـــانێ رەق ڕادەکـــا و نـــانیش لـــــە دەســـــت دەبەنگـــــە

هەتاکەی بوتی تاگەین لەناو چەرخی بیستەما
نوکەر و دژ بە یەکتری کارێکی سوك و نەنگە

(پاکی) بەسە بو نەزان هەر چەند بلێی تی تاگا
لە لای ژیریش دێ دەنگەت هەروەك بروسکە و زەنگە

پاکی
٢ / ٢ / ١٩٩٢

## ئاوارەیی بەشمە

لەناو قەومێ دیل و غەمناك
لەکاتێ پڕ ترس و سامناك
تاوانم چی کە بووم خوێنم
هەراج هەر بۆدەستەی زوحاك

* * *

کوردم ئاوارەیی بەشمە
ئەمەش کە هۆی بەختی ڕەشمە
بۆتە کۆرپەی ساوا لە من
هەموو ساتێ لەباوەشمە

* * *

نەیان پرسی لەمنی داماو
دیل و بەندی نێو تۆڕو داو
ئایە بەم حاڵە دڵ خۆشم
یادونیام چۆن دێتە بەرچاو

* * *

کوردم ئاوارەیی بەشمە
ئەمەش کە هۆی بەختی ڕەشمە
بۆتە کۆرپەی ساوا لە من
هەموو ساتێ لەباوەشمە

* * *

دەردی خەڵکی لەلایێ کە
نەخۆشی دەستی بایێ کە
منی داماو هەموو ساتم
سزا و مەرگ و بەلایێ کە

* * *

کوردم ئاوارەیی بەشمە
ئەمەش کە هۆی بەختی ڕەشمە
بۆتە کۆرپەی ساوا لە من
هەموو ساتێ لەباوەشمە

* * *

دەلاڵ لە رووم هەموو پەستن
هەرچەند نرخم بۆ هەڵ بەستن
شوێن وقەڵەم پەڕاو بێزار
چەند دانیشن یا بۆم هەستن

* * *

کوردم ئاوارەیی بەشمە
ئەمەش کە هۆی بەختی ڕەشمە
بۆتە کۆرپەی ساوا لە من
هەموو ساتێ لەباوەشمە

* * *

له‌ ژێرما زیڕ كه‌ده‌ڕوانم
كه‌چی مرده‌ی له‌تێ نانم
جه‌رگه‌ی شه‌وه‌ وهه‌رچاوه‌ڕێی
مه‌لای به‌ربانگی شێوانم

* * *

كوردم ئاواره‌یی به‌شمه‌
ئه‌مه‌ش كه‌ هۆی به‌ختی ڕه‌شمه‌
بۆته‌ كۆرپه‌ی ساوا له‌ من
هه‌موو ساتێ له‌باوه‌شمه‌

* * *

لافاوی خوێن به‌من هه‌ستا
له‌كۆن و زوو هه‌تا ئێستا
فه‌له‌ك سوڕی نه‌خواردو دیم
خۆكوژی كورد هه‌رنه‌ وه‌ستا

* * *

كوردم ئاواره‌یی به‌شمه‌
ئه‌مه‌ش كه‌ هۆی به‌ختی ڕه‌شمه‌
بۆته‌ كۆرپه‌ی ساوا له‌ من
هه‌موو ساتێ له‌باوه‌شمه‌

* * *

پاكی
١١/١١/١٩٩٥

## ئاوی زمزمە

دیمــــەنی جەرگــــەی بـــەهارەو وادەبــــاریێ نم نمـــــە
گـــواوە رۆی بـــەر دەرکــــی مـــاڵم چەشــــنی ئـــاوی زمزمـــە

گـەر گـــەدای نـــاو شـــاریخۆم بم خـــۆم لـــەلا شـــایە و بـــەڕێز
حـــاکمی ڕۆم و عەجـــەم بم گـــەر غـــەریب بم مـــن چمـــە

پـــول پەرســـت و زۆلـــە کـــورد قـــەت نایـــەڵێ شـــادبێ دڵـــم
کـــون کونـــە ســـینەم نیشـــانەی نوکـــی ســـەد تـــیرو ڕمـــە

مـــافی چـــی خوێنـــی شـــەهیدان بـــوو بـــە دۆلارو خشـــڵ
کـــۆی بـــە قوربـــانی دەمێکـــی مەســـتی دوو پێـــك و قومـــە

خـــوا وەهـــای دانـــاوە بـــەختی کـــورد دەبـــێ ڕەش بـــێ لـــە ژیـــن
بۆیـــە گـــەورەم هـــەر دەمـــێ ڕووی یـــەك لـــە بـــەغدا و یـــەك قومـــە

هـــەر کەســـێ بـــیری ولات و خـــاك و قـــەومی خـــۆی نـــەبێ
بـــاوەڕت بـــێ خۆفـــرۆش و سەرســـەری و هیـــچ و کمـــە

هێنـــدە بـــێزارم لـــە داخـــی کـــورد بـــڵاوی و بـــەش بەشـــی
بۆیـــە (پـــاکی) مـــات لـــە گۆشـــەی غوربـــەتا بـــزرو گومـــە

ئازاری/ ١٩٩٥

## ناتوێنینەوە[٨]

دێ بەگوێم قاقای ڕەقیبەو
شادن لەوەی بۆ كۆششم
گوایە وەك جاران بەگوڕ نیم
بۆ ڕێ ی خەبات یا شۆڕشم

زەق دەڵێم هەی هەشێ بەسەرتان
جەستە پۆلایین قەت نابەزین
چقڵی بینای چاوی زۆڵ و
خۆ فرۆش و ڕووی ناحەزین

بەچكە كورد تا پاڵەوان و
شاخ و كێو بێ دەم سەنگەری
ڕوت و زەردو پێ خواس و
بالیفی بەردبێ ژێر سەری

نانەوشەكەی لا پلاو بێ و
قوربانی كا قوربان سەری
هەردەبێ تۆ سەر بكەی شۆڕ
زەق بێ ڕۆژێك بۆی دەرپەڕی

(٨) ئەم پارچە هۆنراوە دانراوە بەهۆی ڕووداو و كارەساتە مەرگ بارینە دڵتەزێنە خوێناوییەكەی كە بووە لوتكەك لە كێوی قوربانی جەژنی قوربان و پێناسەی قوربانییان بە سەرانسەری جیهان ناساند بە خەلاتی خوێن رژانی ئالْ وگەشیان لە شاری قەلاو نارە لە هەولێر لە بەرواری ١ ی شوباتی ٢٠٠٤ .

لەچەرخی کۆن لەدێرینا
لەرۆژگاری ئیبراهیما
بۆ رزگاری بۆ ئازادی
سەری گۆمان کرد بەهیما

تازە کۆڵدەین بەتیرۆرو
زیندە چاڵ و لەش لەتی
چۆتە خوێن و ئێسك و گیانمان
ماف و بەشمان هەی پێ پەتی

نەکەن بیرێ وەها پەرتو
دەربەدەری کوچەی گێتین
بۆ هەر بستێ لە کوردستان
مین و بورکان لەژێر پێتین

شێخ سەعید و قازی و حەفید
شۆرشی ئێمە رێبەریەتی
رۆنە بەری دەم سێدارەش
بێشك ئازادی بەریەتی

ڕوگـــــەی ســـــوێندمان هـــــەتا مەحشـــــەر
بـــــە ئـــــەنفال و هەڵەبجەیـــــە
بـــــەزیندان و دێ ی ســـــوتاو و
بەدەســـــت و پـــــێ ی کەلەپچەیـــــە

بـــــۆ پـــــەڕینی قـــــاچ و ملتـــــان
لەدەســـــت شـــــیری زولفـــــەقارین
بـــــۆ دڕینـــــی ســـــینەی ڕەشـــــتان
خەنجـــــەرێکی جەوهـــــەر داریـــــن

ســـــینە پـــــۆلاو شـــــاخ و کێویـــــن
ڕووتـــــان بلێســـــەو ئـــــاگرین
وەك بروســـــکەین بومەلـــــەرزەین
کوێنـــــدەر بڕۆیـــــن پـــــێ داگریـــــن

ئێمـــــە خـــــاوەن خـــــاك و مێژوویـــــن
خـــــوێ نـــــین لـــــەئاو بتوێینـــــەوە
پـــــیرە داری ڕەگ ئەســـــتورین
نـــــەو نـــــەمام نـــــین بشـــــکێینەوە

بـــــەفری ســــــەرچیا کەشـــــــی بـــــــەرزین
بـــــــــــــەهاوینیش ناتوێنـــــــــــــــەوە
شـــــــەنگەبی ڕۆخـــــــــــی دەم ئـــــــــاوین
هــــــــەر لـــــــــەخواوە دەڕوێنـــــــــەوە

پـــــاش مردنیـــــــش دوای هـــــــەزار ســــــاڵ
بـــــۆ مـــــاف و بـــــەش هـــــەر دێنـــــەوە
مـــــانگی ونـــــی ژێـــــر تـــــەمیش بـــــین
هـــــــەر دەمێکـــــــــەو هەڵدێنـــــــــەوە

خـــــدری زندەیـــــن قـــــەت، نـــــامرین
هـــــەردەم لەســـــەر پـــــێ و حـــــازرین
شـــــۆڕش گـــــێڕین شـــــۆڕە ســـــواری
ڕێبـــــازی حـــــاجی قـــــــادرین

گـــــەر زوحـــــاکن ئێمـــــە کـــــاوەین
والەبـــــــــەرزین ڕووەو ئاســـــــــۆ
ڕێ ڕووناکـــــــە بـــــــۆ میللـــــــەتێ
ئـــــازاری بـــــێ ســـــەنگی ئـــــاکۆ

ئەگەر گورگن ئێمە شێرین
گەر فیرعەونن ئێمە موساین
مێژوو شایەد بەحاڵمانە
لەدەستی ڕەش قەد نەترساین

ئەگەر ئێوە خاوەن هێزو
تۆپ و فڕۆکەن ئێمەش چیاین
گەر تەپۆڵکەن ئێمە لوتکەین
ئەگەر هەورن ئێمە وەك باین

چیدی لەو چاڵەدا ناژین
بەهۆی شەقی زەمان تیاین
چۆن بێ دەبێ سەربەخۆبین
بێشك لەمە زۆر دڵنیاین

ئێمە هاوڕێ و برای سەختین
گەلێکمان دیوە ئەو دەورە
ناچێتەوە ژێر سەبەتە
ئەگەر بەرخۆلەبوو گەورە

لەدڵی ڕەش و بیری ڕەشتان
هەموو جیهان سەرسوڕمایە
بەدڕەوشتی و فیتنەو فەساد
لەگەڵتان بوو هاتە کایە

هەر لەزوودا لەبری ئاشتی
خوێنڕێژی بوو کراسی بەرتان
عومەر عوسمان علی هەمزە
کێ کوشتی بێ دەستی خۆتان

ئێوە نەبوون لەقەومی لوت؟
خاپور نەبوو شارو دێتان؟
بۆ پەندو عیبرەت کوێر نەبوون؟
نەدرا بەردی ڕەش بەسەرتان؟

لەگەڵ کام هۆزو سەرکردە
نەبوو ناکۆکی یا شەڕتان؟
لەبێ شەرمی قەت عار ناینن
هەرچەند بەلای دێ لەبۆتان

جیهانتان خستە ئاژاوە
بەهاوارو دادو درۆتان
بەئاوی زەمزەمیش بشۆرێن
پاك نابنەوە تاك و كۆتان

لەكۆی مرۆڤ و جانەوەر
لەخوارو سەر لەبەحرو بەڕ
سەیری چۆن خوا ناوی ئێوەی
بردووە بەدگۆ ناپاك وگەڕ

ئێوە نەك هەر دژی مرۆڤن
ئێوە دژی گیان داریشن
بۆ كاری نارەواو بەدكار
ماندوو نابن دانانیشن

جەنگی حوشتر[٩] عایشە نەهات؟
بۆ ئاشتی خواز لەدژی شەڕ
هەرچوار پەلی حوشترەكەتان
ئەی نەپەڕان ئێوەی بەدفەڕ

(٩) جەنگی حوشتر ئەو جەنگەبوو لەنێوان معاویەو علی كوڕی ئەبو تالیب ڕوویدا دوای شەڕێكی قورساوی حەزرەتی عایشە هات بۆ نێوانیان و بۆ ئاشتی خوازی كەچی هەرچوار پەلی حوشترەكەیان پەڕاند.

دەریـــــــای مـــــــردوو لەچیـــــــەوە هـــــــات
زمـــــــانی هـــــــەبا ئـــــــەو دەریایـــــــە
پـــــــێ ی دەگۆتـــــــن چـــــــوار ســـــــەد هـــــــەزار
بەدرەوشـــــــتم لـــــــەژێر دایـــــــە

لافـــــــاوی نـــــــوح لەســـــــەر چـــــــی بـــــــوو؟
مێـــــــژوو بۆمـــــــان شـــــــایەد مایـــــــە
دوای نۆســـــــەد ســـــــاڵ چـــــــی پـــــــێ نـــــــەکرا
نـــــــوح دەنگـــــــی دا لەدونیایـــــــە

تـــــــا لـــــــەکێوی جـــــــودەرە نیشـــــــت
ئەمـــــــەش یەکـــــــەم بەڵگـــــــەو رایـــــــە
لـــــــەکۆی جیـــــــهان دڵپاکـــــــە کـــــــورد
ئاشـــــــتی خـــــــوازو بەوەفایـــــــە

هەرئـــــــەو دەســـــــتە ڕەشـــــــە گـــــــڵاوە
کەللـــــــە وشـــــــك و گێـــــــژو نـــــــەفام
بـــــــێ بـــــــە زەیـــــــی وەك درنـــــــدە
ناویـــــــان لـــــــەخۆ نـــــــاوە ئیســـــــلام

بـــــــەهاریان جەژنـــــــە پـــــــایز کـــــــرد
بەکۆمـــــــەڵ ناشـــــــتنی نـــــــەمام
وەك زوو یـــــــەحیایان ســـــــەربڕی
مـــــــاوە هێشـــــــتا ســـــــەری لەشـــــــام

هەی داوەشێن هەی دارزێن
لەکام دێری ناو قورئانا؟
لەکام ئینجیل زەبور تەورات
لەکام پەرتوکی ئاسمانا؟

خەندە برین و کۆمەڵ کوژی
دەسکە گوڵ بێ لە جەژنانە؟
سەد و هەشتا هەزار نەمام
زیندەچاڵ بێ لەبیابانا؟

کەڵە پیاومان دەبێ دیل بێ
لەدەم قاپی ڕووی نادانا؟
فەیلەسوف و زاناو ژیرمان
گوێڕایەڵ بێ ڕووی نەزانا؟

سەوزو ئاڵ بێ بەرگی ئێوەو
ڕەش بێ ئێمەش لەبەرمانا؟
ئێوە شادو سەرفرازبن
بمرین ئێمەش لەزیندانا؟

تـــــــەخت و تـــــــاج بـــــــێ بەشـــــــی ئێـــــــوەو
قـــــــوڕ بـــــــێ ئێمـــــــەش لەســـــــەرمانا؟
ئەمـــــــە بـــــــڕواو بەرنامەیـــــــە
ئەمـــــــە کـــــــاری موســـــــڵمانا؟

لەیـــــــەك دووریـــــــن لـــــــەکۆی خـــــــاڵا
خـــــــاڵێ نـــــــەبێ ژیـــــــان بەشـــــــادی
ســـــــەرفرازی کوردســـــــتان و
لێدانـــــــی تـــــــەپڵی ئـــــــازادی

دەنـــــــا هـــــــەروەك لم و چـــــــەوین
یـــــــەك نـــــــاگرین سروشـــــــت جیایـــــــە
مێـــــــژووی کۆنـــــــی پـــــــڕ خوێنـــــــاوی
دەیســـــــەلمێنی لەدوونیایـــــــە

تـــــــاپێ شـــــــێلبێ مـــــــاف و بـــــــەشمان
هـــــــەر جـــــــەنگ و شـــــــەڕ لەئارایـــــــە
شەمشـــــــەم بـــــــەرۆژ ، قـــــــەل بـــــــەگوڵزار
ئـــــــاخر توخـــــــوا کـــــــەی ڕەوایـــــــە؟

لەئاسمانتان هەوای دۆزەخ
خۆڵ بارینە و دێتە خوارێ
لەشەماڵ و شنەبای ئێمەش
بۆن گوڵزاری لێ دەبارێ

گۆم و زەلکاو کەوسەرتانە
لەکۆی لاوە بۆی شەڕخوازن
بەمەش هاژەی تاڤگەو، ڕووبار
کانی و کاریز، چەند بێ نازن؟

شاخی ئێمە لانەی شێرەو
قاسپەی کەوەو ئاسکی ڕەوان
دەشتی ئێوەش لەوسەر وسەر
پیرۆزتان بێ بۆ حوشترەوان

پاکی کوردو درۆو فێڵتان
تەرازوو کەین لەڕوو پێوان
لەتای کوردا کێوی بێستوون
نایهێنتەوە بەپیسی وان

لەجیاوازی فریشتەی خوا
کەوتنە شیوەن لە قوڕ پێوان
هەر لەوداخە خوای گەورەبوو
چەق حەمرینی کرد بەنێوان

زانی ئێوە لەداوو فێڵ
وەکو قوتابخانەی شەیتانن
کلیلی دەرگای نەخۆشین
ئێوە دایکی سەرەتانن

هەرچی پێتان کرا کردتان
بەڵام ئەوە قەت ناتانن
بڕوخێنن کێوی هیوا
کێوەکانی بەڕووتانن

ئێمە سەرقافڵەی شەهیدمان
بەقەد ڤینۆس زۆرو بەرزە
پاڵەوانی ئێوەش دیارە
جورجە کۆرەی لەژێر ئەرزە

* * *

پاکی
٢٣ / ٢ / ٢٠٠٤

## هەواڵ پرسین[1]

ئێستا پێم ناڵێی تەندروستیت چۆنە
بۆ وات لێ دەکا ئەم چەرخە کۆنە؟

هێندە دژ بۆچی بەڕووت چویتەوە
تۆش وەها بێزار لەخۆت بویتەوە

قەت شادیت نەدی ناشاد بووی هەردەم
بویتە نێچیری بەر چووڕ نوکی خەم

لەکاتی لاویت هەتا ئەمڕۆکە
دۆشەگی نەرمت بەنی پەڕۆکە

قەت کۆڵت نەدا بۆ چینی چەوساو
هەردەم لەپشتی وەستاوی تەواو

ژیانت سەراپا برسی وتێنی بوو
دڵت وەك قەبرێ پڕ نهێنی بوو

مل کەچیت نەکرد هەردەم ڕوو بەڕوو
وەستای بۆ پیاوی ناکەس و دوو ڕوو

بایەخت نەدا هیچ دەم بەپارە
بۆ هەژار جەرگت کرد پارە پارە

نان و ماستاوێ لەلات حەلوا بوو
چونکە سەر بەرزیت هەرپێ بڕوابوو

بۆیە تا ئەمڕۆش بێ کۆشك و پارەی
کێ بە بیری دێ خەڵکی ئەو شارەی

بەلاّم زۆر سوپاس بەگەنج و پیری
نەبوی بە پیاوی ئاغە یامیری

سامی قانعیش وەك تۆ ژیابوو
ژیانی پڕ خەم وکێشەی تیابوو

هیوای ئازادی و دژی ڕیا بوو
بژی ئەو باوکەی تۆی لێ پەیابوو

میللەت سەربەرزە بەپیاوی وەك تۆ
کە برنجی نەبێ ڕازی بێ بە دۆ

بۆ یە خۆشحاڵە بە تۆ شاری کۆ
مافی هەزارت خستۆتە ئەستۆ

([1]) ئەم پارچە هۆنراوە لە ١٠/١٠/١٩٨٥ لەشاری کۆیە دانراوە ، بەبۆنەی نەخۆش بونی شاعیری هەژاری کورد مامۆستا ملاحسین (سامی عەودالّ ) کەچومەتە سەردانی لەماڵەوە لەگەڵ بەرێز ملا صابر رشید خوالێ یان خۆش بێت .

## فەلەك

ئـەی فەلـەك تاكـــەی لەگـــە ڵمـــا تـــۆ دژی بـــەس لێـــم گـــەڕێ
چـــەوت و بـــەد ڕەفتیـــت هەتاكـــەی تـــاوێ بـــۆ ڕاســـت وەرگـــەڕێ

هـــەردەڵێ ی دوپشـــكی كلكـــت نـــاوە سەرپشـــت تـــۆز دەكـــەی
پێـــوەدان بـــەس بـــەس بەجەســـتەی نـــەرم و پاكـــا هـــەڵ گـــەڕێ

چـــت دەوێ لێـــم نامـــەوێ لێـــت ببمـــە پاشـــای ســـەر زەمـــین
نـــان و ماســـــــتاوێ گەرەكمـــــە و پێكـــــەنینی ســـــەر بـــــەڕێ

چاكـــــە واز بێنـــــم لـــــە داوت ئـــــەی زەمانـــــەی پڕ جـــــەفا
چونكـــە مـــل كـــەچ دیـــم ئەوانـــەی چـــوون بـــەگژتا بۆشـــەڕێ

بـــەختیار و كامـــەران بم چیـــم لـــە گۆشـــەی خـــەم بەســـە
چـــوو ئـــەوەی چـــوو ڕۆیـــی ڕابم دەركـــەم لـــە نـــوێ لاپـــەڕێ

تـێر نـە بـووی (پـاكی) ڕەوشـتی چـەرخی بـەد هـەر فـێر نـەبووی
كۆنـــە ئاشـــێكە بـــە دەســـتی پیـــاوی مـــەرد قـــەت ناگـــەڕێ

پاكی

١٠ / ١٠ / ١٩٩٨

## ئەی دڵ

ئەی دڵ هەتاکەی ئەوبەر ئەو بەری
مەرگە و تێ ناگەی تۆ لەکام بەری

بێ کەڵکە باغی هیوای ژین بەچی
خۆشی گەر نەبتە سێ بەرو بەری

کەمین لەمەرگەو باهەزار تاجی
شاکەی لەسەرو بەرگی کەی بەری

قۆڵ و ئاڵۆزە جیهان بە هەست بە
لەپێش پێش ئەوەی پێشی پێت بەری

زۆڵی بەسەر کەس مەکە بالەخوا
بەس تووك و ئاهونوزت بۆ بەری

دەروون و گێتی و پول بەچاڵ نەکەی
سەختە زۆر باری ئەوسەر دەربەری

پاکی
٢٠٠٠/٤/٥

## دێتەوە کەی

کـــــەی دەبـــــێ ڕۆژێ لــــەناکاو بێتـــــەوە پێـــــم جوانـــــی مـــــن؟
تـــــازە ڕۆیـــــی کۆچـــــەرێ بـــــوو بـــــاری کـــــرد وەك جوانـــــی مـــــن

بڵقـــی ســـــەر ئـــــاو بـــــوو لـــــەناکاو هـــــەر بـــــۆ ســـــاتێ بـــــوو نـــــەما
چـــی بەســـــەرهات ڕۆیـــی بـــۆ زوو کـــــاتی خـــــۆش دەم ژوانـــــی مـــــن

بـــــەزم و خـــــەندەو پێکـــــەنین و خۆشـــــی و ســـــەیران و ســـــەفام
بـــزرە هـــــەروەك دۆســـــتەکانی جـــــان بـــــەجان ســـــەر خوانـــــی مـــــن

کـــــۆی خـــــەیاڵات وەك شـــــەقامێ دڵ بەســـــەریا ڕادەبـــــێ
بـــەس ئـــەوەی هـــات وەك ڕۆمـــانێ هـــەر بـــە یـــادت دوانـــی مـــن

چـــــی هـــــەڤاڵێ بـــــووم کەتوشـــــی داوو دەردێ بـــــووم هـــــەڵات
خـــەم نـــــەبوو کـــوا بـــۆ پزیشـــکێ نـــەی دەکـــرد هـــــەتوانی مـــــن

کـــــەی شـــــەڕاب و زولـــــف و گۆنـــــا مەینـــــەتی بـــــەربا دەدەن
پێچەوانـــــە هەربـــــەلاٌن وەك دەســـــتێ ڕەش زۆر شـــــوانی مـــــن

چـــی بـــزەی خۆشـــــی تیـــــابێ نـــــەم گـــــەرەك نەیســـــە بـــــەڵام
کـــوا وڵات و مـــاف بـــەکێ چـــوو بۆچـــی خـــۆم وون کوانـــی مـــن

لۆمـــە واژەی (پـــاکی) توخـــوا قـــــەت مەکـــەن بـــەو بـــارەوە
گرمـــە گرمـــی هـــەوری ڕەش هـــۆی حـــاڵی مـــن بـــوو ڕوانـــی مـــن

# ئێشی زام

لەئێشی زامدار هیچ کەس نازانی
کە وەك خۆی لە خۆی دەگا و دەزانی

زمانیش نەهێنی هەموو دڵ ناڵێ
کە وەك دڵ لە دڵ دەگاو دەزانی

چاری دەردی خۆی دەکا ئەو کەسەش
لەپێش هاتنیا ئەگەر بزانی

پەنجەی قەدەریش کەهات ڕووبدا
هەردێ گەر ژیرو هەزار زۆر زانی

گەڵێ لەمەیدان خۆی بە ڕۆستەم کرد
ڕێویش دەر نەچوو دوایی کەزانی

ناخۆشی و سەختیش گەربەدەست خۆبێ
پەنجە هەڵ دەبڕی دیارە ڕەزانی

لوت بەرزو باییش مەبە بە ڕۆژگار
هەردەم تۆ گەڵای بەر بای خەزانی

نـــــــادان نـــــــــەزانی خـــــــۆی لاهونـــــــــەرە
ئـــــەو كـــــە تـــــێ ناگـــــا مەبەســـــت چوزوانـــــی

بـــــەس ئـــــەوەی ئێمـــــەی زینـــــدە بـــــەچاڵ كـــــرد
حوكمـــــــــڕای كوێـــــــــری و دەردی نـــــــــەزانی

پاكی
١٩٨٦

# خۆم

خۆم کێشەی بەختی ڕەشم بوو لەژین
خەڵکی بە کێشەم لەسەرچی دەژین؟

خۆم باغی هیوام شێلاو هەڵوەراند
تاوان لەسەرچی لە ئەستۆی پەرژین؟

خۆم سزای حوکمی خۆم دا تائەبەد
حاکم لەسەرچی تەختی دا هەژین؟

خۆم سەر بەتۆری ناحەزو بەد چووم
دۆستان لەسەرچی کەوتنە خوێن مژین؟

خۆم ڕووم نەبوو ڕووی یاران ببینم
یاران لەسەرچی هاتنە ڕوو پۆشین؟

خۆم هەتیوم کورد وڵات و جێم هێشت
کوندەبو بۆچی نەبتە میرنشین؟

خۆم چووم بەناخی مەشخەڵی گڕەوە
پرسە لەسەرچی بۆ گیانی شیرین؟

خۆم کردمە ئەستۆ گوناهو تاوان
یاشێخ لەسەرچی وەر گەڕا لەدین؟

خۆم وەك پاساری باڵ شکاو کەوتم
بۆ بەخۆم ناگرێ لەسەرچی زەمین؟

خۆم پەلەی مەرگی ناکامی خۆم بوو
گیان کێش لەسەرچی هاتۆتە لەرزین؟

خۆم تاکە سواری جەنگا بووم گڵاّم
لەشکر لەسەرچی هاتوتە بەزین؟

خۆم باری خەم و جەفام نا لەپشت
شادی لەسەرچی دای بە کۆڵ سەفین؟

پاکی
٢٠٠٠/٢/٢

## پێم دەڵێن

هەر دەڵێن ماوی لام گومانێکە
من لە ئەو مانە کە چۆن مانێکە

نەم دی ژیرمەندێ شاد و بەختەوەر
کۆی بەڕێز وەستای هەزار مانێکە

گوێ نەگری تەلی ئاهی پڕ سەردم
تێ ناگەی سۆزی چەند کەمانێکە

کێو لەچاو سەنگی پارسەنگی خەمم
تۆزێ وەك مشتێ لەخەرمانێکە

سەرقاڵی ئەوەم شادی چۆن دەڕوێ
سروشت ئایا دەیدا یا دەرمانێکە

یادی منداڵی ماوە پێ (پاکی)
ئەم دەنا کۆشتەی دێر زەمانێکە

پاکی
٢٠٠٢/١/١

## موژدە

مـــــــوژدە مـــــــوژدە دۆســــــتەکان گـــــەنج و پـــــیران
شـــــوێن هەوارگـــــەی گـــــەو هـــــەری بـــــاو باپـــــیران

شـــــاد بـــــە ئێـــــوە ڕۆژی دادیٚ بێمـــــەوە
مەرهـــــەمی بـــــیٚ ئـــــەو دڵـــــەی خانـــــە وێـــــران

دێمـــــەوە بـــــۆ ڕووی بەهەشـــــتی ســـــەر زەمـــــین
ســـــەر هـــــەزارو هێمـــــن و کـــــۆی ســـــەروەران

وەك هـــــەتیو کـــــەوتوم لەکوچـــــەی قوژبنـــــیٚ
لێـــــم مـــــەبن دڵگـــــیرو پەســـــت و نیگـــــەران

ژینـــــی دۆزەخ دوور وڵاتـــــی و دیلـــــی یـــــە
خۆشـــــە مردنـــــیٚ نـــــەك لـــــە دۆزەخ ناوژیـــــان

ژێـــــرە پـــــیٚ بـــــیٚ تـــــەختی پاشـــــای غوربـــــەتی
چـــــۆن بـــــەهارمی تیـــــا لـــــە پـــــایز هـــــەڵوەران

پاکی
٩/ ٢/ ٢٠٠٢

## هەڵۆ بەرزە[1]

قەت نەبوو کەس هاوبەشم بێ بۆ پەژارە و مەینەتی
بۆیە ئەمڕۆ کەوتمە داوی دوور ولاتی و غوربەتی

هەردەڵێن دڵسۆز لە ژینا زۆرە کوانێ هیمەتی
بەرد لەشوێنی خۆی بەسەنگە دەربچێ کوا قیمەتی

خۆم هەڵۆ بەرزە و لەکونجی کاولی خەم دانیشتمەوە
بۆیە ناکەس وا لەسەرما زۆرە هێرش وهەڵمەتی

چوو لەدەستم تازە ڕۆیی ئەو بەهارەی تیا کە بووم
بۆیە جێم هێشت بۆ کەسانێ زۆڵی ماف ژێر پێیەتی

پێم مەڵێن دەرچوو لەپێناو خۆشی خۆشیم لێ بڕا
من هەلاتووی دەست حوکمڕای کوێریمە و خۆ خۆیەتی

سۆما بینای چاوەکانمە ڕووگەمە گوڤکی ولات
قرچە قرچی جەرگی سوتام شاهیدی تۆو خۆیەتی

خوابە هەشتی دوو جیهانی کرد حەلاڵ بۆ کورد بەلام
ئەو بە هێزی یەك نەبوونی خۆی شکاندنی ڕوئیەتی

پاکی
ئادار ١٩٩٦

---

(١) کۆپلەیەك لەم شیعرە مەرزی یە خانی فەریقی کردویەتیە گۆرانی

# چیبکەم

لەسەر زوحەیلا دێدێ مەینەتی
خۆی بەسەر مندا دادەدا چیبکەم؟

شادیم گەرەك بوو تۆزێ نەك بەپڕی
لەبری خەڵاتم دەرد دەدا چیبکەم؟

زستان بەو بەهار بۆمن بە هاریش
چوار کژ بە زستان سوور دەدا چبکەم؟

لەڕێی هات نەهات پیربوم و نەهات
بەمرۆ و بە دوێنێ و بەفەردا چیبکەم؟

لەساویلکەی خۆم کۆی خەمی دونیام
هێناو بە کۆڵی خۆم کەدا چیبکەم؟

دونیام پشکنی نەم دی دڵسۆزێ
دەست باری سەختیم بۆ ڕەدا چیبکەم؟

هێشتا پێی کەم و یار نەبێ ڕازی
(پاکی ) سەربێ بۆی وەك گەدا چیبکەم؟

پاکی
١٩٩٧ / ٦ / ٢

## ئاشی خەیاڵە

هـــەروەك ئاشـــی خەیاڵـــە ئـــەو جیهانـــەی تـــۆ کـــەڵی
دەتـــهاڕێ وەك دەســـتاڕێ هێـــواش تـــاور: دەبـــێ پـــێ

بـــێ وچـــان تـــۆ بـــەڕێوەی کـــاتیش لەســـــەرخۆ دەڕوا
بیرکـــەوە دوێنـــی چ بـــووی کـــەچی ئـــەمڕۆ لەســـەر پـــێ

لەزانســـت بـــوون نەبوونـــە چـــۆن هـــاتی ئـــەوهاش دەڕۆی
مـــل کـــەچی ژێـــر قەدەربـــە بـــۆ کـــوێ دەڕۆی کـــە هـــەڵ دێ

وەك بـــاڵندەی لەدەســـت بـــاز ســـەختە زۆر بـــبی دەربـــاز
وێنـــەی دەریایـــە ڕۆژگـــار تـــۆش لـــەناویا بـــەفرو خـــوێ

مەڕوانـــە قـــەت کـــەژیری لـــە ژیـــری لێتکـــە دیـــاری
بـــۆ هەڵـــەش لـــەپێش نـــەزان هـــەتا مـــردن لەســـەر پـــێ

ڕێـــڕەوی ژیـــان بـــەردەوام دێ لـــە دووتـــا وەکـــو تـــۆ
پایـــە دەمێکـــە ناکـــەس بـــوو بـــە مـــیر پـــێ مـــەڵێ کـــێ

بڕوانـــە شـــیرین بـــەتاڵ ســـەیری تـــاڵ کـــە بـــە شـــیرین
وریابـــە بـــۆ یـــەك بـــزە کۆمـــەڵی شـــین هـــا لـــە جـــێ

هـــەتا لاوی بـــەهێزی لـــە پـــیری بـــەرەو کوێـــوە
ســـادەبە ئـــالۆز مەبـــە دوو ڕۆژ مـــاوە تیـــا کـــەتێ

پاکی
١٩٩٨/١١/١٥

## هاتەوە

ئـــەو دڵـــە پـــڕ حەســـــرەتە شـــێتە نـــەبوو قـــەت داکـــەوێ
جـــارێ نـــا ســـەد جـــار دەرم کـــرد دێتـــەوە و کـــەس نایـــەوێ

ســـەختە گونجـــان ژیـــان لەگـــەڵیا بـــەزم و ســـەیری وا دەکـــا
ژیـــر نـــەبم دەبـــوا بـــە واژەی بـــەردەوام هـــەر پێـــم کـــەوێ

پـــێی دەڵێـــم شـــادی بخـــوازە دەگـــرێ ئـــەو تـــاڵی بـــەخۆی
هـــەر بـــە پرتـــەو بۆڵـــە هـــەروەك بـــێ لـــەماڵی دوو هـــەوێ

پـــێی دەڵێـــم بـــەس ســـینەیاد ئـــەو بـــەڕووم دادێ و دەڵـــێ
ئۆقـــرە نـــاگرم ڕوولـــە کـــوێ کـــەم فـــێرم چونکـــە ســـەربەوێ

پـــــێی دەڵێـــــم لاو چـــــاك و ژیربـــــە وردە داوی ڕۆژگـــــار
ئـــەو دەڵـــێ ژیـــری لـــە بـــۆ تـــۆ مـــن کـــە بـــەختم دەســـت کـــەوێ

جـــار بـــە جـــاریش شـــین دەگـــێڕێ گوایـــە هـــەر بســـتێ لـــە خـــاك
لـــەم جیهانـــــە وەك هێلانـــــە بـــۆی نیـــــە تیـــــا بســـــرەوێ

هاتـــە ســـەرما پـــەل پـــەلی کـــەم پـــێی وتم بـــۆ وەك ڕەقیـــب
تونـــد دەکـــەی تـــاوان لـــە ئەســـتۆم دەمکـــوژی چـــت لێـــم دەوێ

دڵ هـــەتیوە کاتـــێ دووری تـــێ کـــەوت بـــێ نـــاز دەبـــێ
وەك نـــەمامێ بـــێ گـــەڵا کـــەس ناچتـــە ژێـــری پـــاڵ کـــەوێ

گرتمــــه بـــاوەش تونـــد گوشـــیم و نامـــه ســـینگ وەك کۆرپەکــــەم
ئاوێتـــــەی یـــــەك بـــــین مەحاڵـــــه کێـــــوی هیـــــوا ناکـــــەوێ

پاکی
٢٠٠٠/٥/١٣

## هەموو هەنگاوێك

کاکی برای کورد هەموو هەنگاوێك
خوێنی هەزاران شەهیدی کوردە

ئاوی نێو دەریا و هەموو پەنگاوێك
فرمێسکی دایکی ئازا و نەبەردە

هەموو چرکەیەك لە ژین کە دەڕوا
دەرچوونی گیانی هەزاران مەردە

هەموو هەورێك و تەم لە ئاسمانا
پڕ ئاهو ناڵەی هەناسە سەردە

دڵ بە زامانیش بەوە بناسە
سەیری شێوەی کە ڕەنگی زەردە

باوەڕیش مەکە تا سبەی دەژی
هەزاران سبەی ژێر خۆڵ و بەردە

لەکۆی جیهانیش چرکەیێ شادی
باوەڕکە نییە نەیکەی پەروەردە

دەوری زەمانەش گشت دەم و ساتێ
ڕووی لەلایەکە و وەك تۆز و گەردە

پاکی
نەورۆزی ١٩٨٠ کۆیە

## پێشکەش بە ڕۆلەکانم
## شەش خشەکی شیعری پاکی

ڕۆڵــــە شـــێواوم بۆتـــان غـــەمبارم پەســـت و بـــێ هـــۆش
بۆیـــە حـــەز دەکـــەم کـــەوا ئاگـــادار بـــی لێـــم ئـــەتۆش
بـــەدڵ زامـــداری ئێـــوەم ژیـــان مەرگـــــە و فـــەرامۆش
هـــەردەم لـــە خوێنـــی منـــن بـــەیادتان دڵ دێتـــە جـــۆش
خۆشـیم کاتـێ منـاڵ بـوون کـە سـەرتان بـوو لەسـەر کـۆش
ئەگـــەر هـــەر کاتـــێ مـــردم چاوەکـــانی ئێـــوە خـــۆش

**********

ڕۆڵـــە هیوامـــە بگـــری نـــەك دەســـت کـــەی بـــە پێکـــەنین
ئێســـتا لاوی دڵ گـــەرمی لـــە نێـــوان ڕاســـت و چـــەمین
لـــێرە مەبەســـتم دوا ڕۆژ خـــەم دانـــەگری و ماتـــەمین
خـەڵکی هـەر یـەك بـە جـۆرێ لێـت دەخـوا لەسـەر زەمـین
وردبـــە هەرچـــەند پێـــت دەکـــرێ نـــەك زوو بکەویـــە کـــەمین
ئـــەوەی تـــوش بـــوو لـــە ســـەرووەی نـــەزان، دڵ پـــاك وئـــەمین

**********

ڕۆڵـــە حوکـــم بـــەخۆت دە، چـــالاك و چوســـت و وریـــا
کـــردەی پەشـــیمان بـــە نـــەك بڵـــێی کردبامـــە بریـــا
هـــەتا چـــاك مەلـــەی نەکـــەی مـــەچووە ســـەر ڕۆخـــی دەریـــا
درێخـــی مەکـــە هـــەردەم بـــۆ چاکـــەو دەســـتی فریـــا
زەمانـــەش زاڵـــە بـــۆ خـــۆی هـــەرچی بیکـــا لـــە دونیـــا
کـــەم ڕووی داوە پێکـــەنین هـــەتا چـــەند جـــار نـــەگریا
**********
ڕۆڵـــە وردبـــە ســـەرنج دە بـــۆ کـــار و مایـــە و بەرهـــەم
خـــەم لـــە دینـــار دامـــەگرە گـــەر دەی پـــارێزی درهـــەم
ئاڵۆزمەبـــە بـــە قۆڵـــی قـــەت مـــەچووە نـــاو دەرد و خـــەم
جـــەفا و خۆشـــی کاتیـــە هـــەمووی تێـــك دەچـــێ ســـەرجەم
هـــەر کـــەم زامـــێ لـــە جەســـتە هـــەبوو زوو لێـــیدە مەرهـــەم
فـــەرهادچ بـــوو ئاکـــامی ســـووتا بـــۆ شـــیرین وەك شـــەم

**********
ڕۆڵـــە گاڵتـــە و گـــەپ مەکـــە کـــاتیش مـــەدە بـــە فـــیڕۆ
پەلـــە و دەنـــگ بـــەرز مەکـــە ئـــارام بگـــرە لـــە ســـەرخۆ
دۆســـت و دوژمـــن بناســـە نـــەوەك هـــەر بخـــۆ و بـــڕۆ
ڕێـــزی خـــۆت هەرچـــەند بگـــری پایـــە دەبەخشـــی بـــە تـــۆ
کـــە مـــاڵت بـــوو ببەخشـــە قـــەت مـــەپارێوە بـــە درۆ
پاشـــا و گـــەدا کـــە مـــردن چـــی بـــوو بردیـــان لەگـــەڵ خـــۆ

ڕۆڵــــە مەکـــە شـــین و زار بـــۆ هــــەندێ لـــــە گریــــە و زار
زوو خـــێرا بـــاوەڕ مەکـــــە ڕامەکــــە بــــە دوای لـــــە غــــار
ئــــەوەی ڕاســــت و تـــــەواو بـــێ تەنــــها یـــەکێ لـــــە هــــەزار
ئەگـــــەر دەســـــتی بـــێ دەســـتی دەبـــڕێ دەســـــتی مــــام و خــــار
شــــینی ســــیحر وجــــادووە ناچــــارە و قورســـــە لـــــە بـــــار
نــــەت بیســــتووە پێــــوەدا بـــۆق گـــەڵی پیســــترە لـــــە مــــار

*********

ڕۆڵــــە بەهەســــت و وردبـــە نـــەوەك لـــەپاش بـــەردی کـــەڕ
جیــــاوازی زۆر پێویســــتە لـــــە مابـــــەینی وشـــــك و تــــەڕ
بەئاشـــــتییانە بڕۆپێــــش نـــــەوەك بـــــەهۆی زەبـــــر و شـــــەڕ
قســــەی کۆنــــە وتـــــراوە هــــــەر لـــــە تـــــەنکی دەدڕێ بــــەڕ
بـــۆ گـــورگ ســــەما مەکــــە شـــینیش مەکــــە لەگــــەڵ مــــەڕ
ڕێـــوی هەڵگــــەڕێ لـــــە کونــــێ بـــێ شــــك دوایـــی دەبـــێ گـــەڕ

**********

ڕۆڵــــە زانســــت و زانـــــین لـــەناو ئێمـــــە کـــــەی بــــاوە
شــــەق و زەبـــــر و تـــــێ هــــەڵدان لولـــــەی تفــــەنگ تـــــەواوە
بۆیـــــەك هـــــەمووی دوژمنـــــن خــــــەریکی فێـــــــڵ و داوە
بۆیـــــە زانامـــــــان جـــــــەرگی لەگۆشــــــەی خـــــــەم ڕزاوە
ئــــەوەش چــــا دەبـــــێ و نابـــــێ ئێمـــــەی خســــتۆتە دواوە
ڕاوی ڕێـــوی بـــۆ کــــەورەو پــــەندە لـــــە کـــۆن وتـــــراوە

**********

ڕۆڵــــە لــــە کــــۆی خاڵــــەکان ئــــەو خاڵــــەی لێ گەورەکــــە
منــــاڵ مــــەدە هیــــچ کەســــێ بــــەخۆتی پەروەردەکــــە
بــــۆ شــــەوێ جــــێی مەهێڵــــە لــــەو مــــاڵ و ئــــەو گەڕەکــــە
بــــەتۆی زانســــت و زانــــین وەرد و شــــۆی ئــــەم دەورەکــــە
دوایــــی نابــــێ بــــە مولّکــــت ئەگــــەر ڕاســــتت گەرەکــــە
کــــێ تــــۆی بــــەزەوی داکــــا بــــۆ ئەویشــــە بەرەکــــە

**********

ڕۆڵــــە کــــاری ژیــــر نی‌یــــە خــــۆت چراکــــەی لــــە ژیــــانت
بــــۆ ڕۆشــــنایی ئــــەم و ئــــەو کێــــوێ خەیتــــە ســــەر شــــانت
ئــــەمڕۆ کــــەوتی بــــۆ ســــبەش ئــــەو غــــارە بــــۆ ســــەیرانت
بزانــــە تــــا لــــە خۆشــــی چــــەند هــــەی بــــۆ دەور و بــــانت
هیــــوا بــــبڕە بــــۆ بــــاغی هیــــوا کــــەس بــــێ تامــــانت
دوژمنیــــش دۆســــتە ئــــەو دەم ڕاخــــراوە ســــفرە و نــــانت

**********

ڕۆڵـــــە دڵنیـــــام لـــــەوەی پـــاکم گشـــــت دەمـــــێ بۆتـــــان
لــــە ژێـــر خـــاکیش چـــاوەڕێم بـــۆ حـــاڵی هەشـــــت و نۆتـــان
نی‌یـــــە مەرهـــــەمی زام و خـــــەم خـــــۆری تـــــۆ و شـــــۆتان
بۆیـــــــە گـــــــەلێ پێویســــــــته ئاگـــــــاداربن لـــــــەخۆتان
یـــاخوا قـــەت دەســـت کـــورت نـــەبن کـــەم نـــەبێ نـــان و دۆتـــان
ژێـــر نـــەبن هـــەر دۆڕاون خـــاوەن بـــن مۆڵکـــی بۆتـــان
**********
ئیـــتر خـــوات لەگـــەڵ ڕۆڵـــە ڕەوشـــتت بـــەرز و جـــوان بـــێ
ئەمانـــە کـــۆی هـــەموویان بـــا لات بـــەها و گـــران بـــێ
بیخـــەرە خوێـــن و هۆشـــتان نـــەك بـــۆ قســـە و گـــەمان مابـــێ
بـــا وەکـــو شـــوان لـــە پشـــتان توورەگـــەی ئـــاو و نـــان بـــێ
پـــەیڕەوی کـــەن زۆر بـــە دڵ بۆتـــان مامۆســـتای ژیـــان بـــێ
وریـــابن ســـەخت و قورســـە نانتـــان کـــەم و لـــە بـــڕان بـــێ

پاکی
١٩٩٥/١٠/١٩

## زەمانە

چۆن زەمانە پیری کردم زوو بەزوو
چۆن شێواندی هۆش و ژیرو ڕەنگ و ڕوو

چۆن گوڵی هیوام بەسەرچوو هەڵ وەری
چۆن لە خۆشی چەند هەیە بووم بێ بەری

چۆن لەچاوم دێتەخوار ئەسرین بە خوڕ
چۆن کە نەم دی باوەشێکی گەرم و گوڕ

چۆن لەتاریکی و شەوە زەنگ بەندە بووم
چۆن بەحەسرەت پێکەنین و خەندە بووم

چۆن برینی کۆن و تازەم قەت لەبۆی
چۆن نەبوو دەرمانی زامی سفت وسۆی

چۆن مەلولی زورگ و ئەو دەشت و دەرەم
چۆن بێگانەی خەڵکی ئەو دەورو بەرەم

چۆن ئەسیری سەختی تاریکم لەشەو
چۆن بە حەسرەت ئەو دەمەم چاوبچتە خەو

چۆن لە ماڵی خۆم هەناسەم ساردە دێ
ناحەزیش چۆن وابە ڕووم هەر غارە دێ

چـــــۆن لـــــەجێی شـــــێر ڕێـــــوی ڕاکـــــەی یاری‌یـــــە
دیـــــارە یاســـــا شـــــەرمی چـــــوو بـــــێ عـــــاری یـــــە

چـــــۆن هیـــــلاك و دڵ بـــــەزام و ڕەنجـــــەڕۆم
چـــــۆن کەســـــەخت وتاڵـــــە هـــــەرچی بـــــۆی دەڕۆم

چـــــۆن پـــــەڕا گـــــەندەم لـــــەخاکی دوور وڵات
چـــــۆن لـــــە بـــــەختم ڕۆژ کـــــەوون بـــــوو هەڵنـــــەهات

چـــــۆن لەگـــــەنجی بوومـــــە پـــــیر پشـــــتم چـــــەما
چـــــۆن کـــــە نوقمـــــم کەوتمـــــە ژێـــــر دەریـــــای خـــــەما

چـــــۆن کـــــە کوشـــــتەی تـــــیری دەســـــتی ناحـــــەزم
چـــــۆن بـــــەخۆڕا چـــــوو بەرهـــــەمی بـــــاخ و ڕەزم

چـــــۆن بەتەنـــــها بـــــووم بەپـــــەندی عالـــــەمێ
چـــــۆن نـــــەما کـــــەس نێتـــــە بـــــاس وپێـــــم نـــــەڵێ

پاکی
ئادار_١٩٨٠

## غوربەت

## چوار خشتەکی شیعری پاکی

کێ بەبای دا ژیانی من غوربەت نەبێ
کێ سوتاندی گیانی من غوربەت نەبێ
کێ شێواندی جوانی من غوربەت نەبێ
کێ بوو دژ بۆ مانی من غوربەت نەبێ

* * *

کێ لافاوی شینی کورد غوربەت نەبێ
کێ بوو مەرگی ژینی کورد غوربەت نەبێ
کێ موتوربەی برینی کورد غوربەت نەبێ
فەیلەسوف کێ دینی کورد غوربەت نەبێ

* * *

ئای لەباری سەختی قورسی غوربەتا
هەر لە چرکەی مردنێکت حەسرەتا
پێکەنینی شینە مەرگ، عیللەتا
دۆزەخێکە دەیکڕی خۆت هەڵبەتا

* * *

کێ خنکانی ڕاز و ویست غوربەت نەبێ
دایبڕی کێ خۆشەویست غوربەت نەبێ
بێ وەفایی کێت کە بیست غوربەت نەبێ
چی نەکرد پێم نەم دەویست غوربەت نەبێ

چــــاندی کـــێ تـــۆی دڵ ڕەقــــی غوربــــەت نـــــەبێ
تـــیری کـــێ لــــە جگــــەر چــــەقی غوربــــەت نـــــەبێ
هـــێزی گـــــەردوون کـــوا شــــەقی غوربــــەت نـــــەبێ
دڵ لــــە حەســـــرەت کـــێ تــــەقی غوربــــەت نـــــەبێ

* * *

ئــــای لــــەباری ســــەختی قورســــــی غوربـــــەتا
هـــــەر لــــە چرکــــەی مردنێکــــــت حەســــــرەتا
پێکـــــــەنینی شــــــینە مەرگـــــــە عیللـــــــەتا
دۆزەخێکـــــــە دەیکـــــــڕی خــــــۆت هەڵبـــــەتا

* * *

کۆشـــــکی شـــادیم بـــۆ ڕمـــا غوربـــــەت نـــــەبێ
داری هیـــــوام بـــــۆ چــــەما غوربــــەت نـــــەبێ
دۆســـــت و ئــــەحباب بــــۆ نــــەما غوربــــەت نـــــەبێ
هـــەرچی بـــووم چـــوو چی کـــەما غوربــــەت نـــــەبێ

* * *

کـــێ تۆرانـــــدی چـــاو بـــــەناز غوربــــەت نـــــەبێ
بۆچـــی کۆرپـــە بـــوو بـــێ نـــاز غوربــــەت نـــــەبێ
کـــێ هەڵـــەی تـــووش کـــرد بــــەیاز غوربــــەت نـــــەبێ
کــــەی بــــە تـــۆڕ گـــیراوە بـــاز غوربــــەت نـــــەبێ

* * *

ئـــــای لـــــەباری ســــــەختی قورســــــی غوربــــــەتا
هــــــەر لــــــە چرکـــــەی مردنێکــــــت حەســــــرەتا
پێکـــــــــەنینی شــــــــینە مەرگــــــــە عیللـــــــــەتا
دۆزەخێکـــــــە دەیکـــــــــرِی خـــــــۆت هەڵبـــــــەتا

* * *

بـــــۆ بـــــەلاّ رِێـــــم هـــــات بـــــە کـــــۆ غوربـــــەت نـــــەبێ
بـــــۆ غـــــەریب لێـــــم شـــــاری کـــــۆ غوربـــــەت نـــــەبێ
بـــــۆم نـــــەبی بـــــۆ ســـــەر ســـــەکۆ غوربـــــەت نـــــەبێ
گـــــرِ نیـــــە بـــــەگیانی تـــــۆ غوربـــــەت نـــــەبێ

* * *

کێـــــوی خـــــەم کـــــێ دای بەشـــــان غوربـــــەت نـــــەبێ
کـــــێ بـــــوو جەســـــتەی هەڵوەشـــــان غوربـــــەت نـــــەبێ
زولفـــــەقار کـــــێ رِای وەشـــــان غوربـــــەت نـــــەبێ
ســـــووکە بـــــەخوای رِوح کێشـــــان غوربـــــەت نـــــەبێ

* * *

ئـــــای لـــــەباری ســــــەختی قورســــــی غوربــــــەتا
لەهـــــەر چرکـــــەی مردنێکـــــت حەســـــرەتا
پێکـــــــــەنینی شــــــــینە مەرگــــــــە عیللـــــــــەتا
دۆزەخێکـــــــە دەیکـــــــــرِی خـــــــۆت هەڵبـــــــەتا

* * *

دای هێنـــــا کـــــێ غوربــــەتی غوربـــــەت نـــــەبێ
بـــــۆ بــــە ناکـــــەس خزمـــــەتی غوربــــەت نــــەبێ
حـــاجی بــــۆ شــــکا هیمــــــەتی غوربــــەت نــــەبێ
ســــــەروەتی کــــــوا ســــــەروەتی غوربــــەت نــــەبێ

* * *

حوکمـــــی کــــێ زوحـــــاکی بــــوو غوربـــــەت نـــــەبێ
کــــێ هۆلاکــــۆ کــــاکی بــــوو غوربـــــەت نـــــەبێ
فیرعــــەون کــــێ بــــاوکی بــــوو غوربـــــەت نـــــەبێ
کــــێ ســــەد بــــاب یــــەك داکــــی بــــوو غوربـــــەت نـــــەبێ

* * *

ئــــــای لــــــەباری ســــــەختی قورســـــــی غوربـــــــەتا
هــــــەر لــــــە چرکــــــەی مردنێکـــــــت حەســـــــرەتا
پێکــــــــەنینی شــــــــینە مەرگــــــــە عیللــــــــەتا
دۆزەخێکــــــــە دەیکــــــــرێ خــــــــۆت هەڵبــــــــەتا

* * *

کێ ڕووخـــــانی هەســـــتی مـــــن غوربــــــەت نــــــەبێ
کــــێ شــــکاندی دەســــتی مــــن غوربــــەت نــــەبێ
کــــێ چ گوللــــەك خســــتی مــــن غوربــــەت نــــەبێ
وەك دوڕە هەڵبەســــــتی مــــــن غوربــــــەت نــــــەبێ

ئـــــای لـــــەباری ســـــەختی قورســـــی غوربـــــەتا
لەهـــــەر چرکـــــەی مردنێکـــــت حەســـــرەتا
پێکـــــەنینی شـــــینە مەرگـــــە عیللـــــەتا
دۆزەخێکـــــە دەیکـــــرِی خـــــۆت هەڵبـــــەتا

* * *

پاکی
٦/ ٧/ ١٩٩٩

ئەم هۆنراوەیە چەند کۆپلەیەکی لە گۆڤاری بێوار بڵاو کراوەتەوە لە ژمارە (٥٢)ی ساڵی ٢٠٠٠، هـەروەها لـە گۆڤاری رۆژ کەلە دانیمارك دەردەچێ بڵاو کراوەتەوە.

# ساوای لانك

مات و دەست ئەژنۆی گۆشەی قوژ بنێ
لەشاشەی ژیانی خۆم ڕادەمێنم

ژیانی بەسەر چووی ڕابردووی تالم
هەروەکو ساوای لانك دەژێنم

بەجۆشی قولپەی هەنسکی ساردم
دڵە مردووەکەی پێ دەبزوێنم

بەفەرشی نەخشی گوڵزاری مەینەت
ڕۆژێ ڕەش تری چاو پێ هەڵدێنم

جەستەم کردۆتە باخچەیێ ڕەنگین
زامی کۆن و نوێی تیا ناو دەڕوێنم

یەك یەك و دوو دوو بەچەپك و دەسك
لەڕووی باوەشی شێوای وەردێنم

نامەوێ شادی بەڕووم بێ شادی
ژێر خەمی دەکەم تا دەی ڕزێنم

پاکی
٥ / ١٠ / ١٩٩٨

# هیواکانە

ویست و ئارەزووی هیواکانە کۆی
بەرلەدایك بێ لە خنکانە کۆی

هەر عەشقە خوایی و ئەڤینی پاکە
بەم کێوە دینە وەك شێتانە کۆی

کلّپەی بلّێسەی ئاگری دەرونە
چرای ڕوناکی سەر ڕێتانە کۆی

هەرشەقەی باڵی پیرۆزی ڕوحە
باڵندە ئاسا لەسەرتانە کۆی

ئەسرینی دەریای خوێناوی چاوە
سەیلی وەك دەریای بەر چاوتانە کۆی

هۆش و ژیر بلاّوی پڕژاوی منە
وابێ سەرو شوێن کۆی شوێنانە کۆی

شین و گریەو ڕۆی تۆزێ شادییە
لە هەر کونجێکی ئەم جیهانە کۆی

دادو هاوارو سکالاّی خەڵکە دێ
لەبێ وەفایی ئەم زەمانە کۆی

١٢ / ٨ / ١٩٨٨

# تێ ناگەم

چـــۆن بکـــەم حـــاڵیت تـــێ ناگـــەم ئـــامنیش وەك تـــۆ ورِم
تـــێرە مـــەی بم بۆچـــی نـــابم بـــۆ کـــە پـــێی ناشـــکێ بـــڕم

ئایـــە ســـاوا بۆتـــەوە دڵ حـــەز لـــەتفت، و تـــاڵ دەکـــا
یابـــە خـــۆم هـــەروا نـــەزان و گێـــژ لـــەپاش بـــەردی کـــەڕم

یابـــە لێشـــاو دێ خـــەمی مـــن هەریەکـــەو ســـەد ســـۆی هەیـــە
یاشـــپرزەی وەم تـــێ ناگـــەم ســـەر بـــەکام لا دەربـــڕم

یـــا بـــەمن وەك عەشـــقی خوایـــی چویتـــە ریشـــەی خۆێنمـــەوە
یـــا لەبـــەر لافـــاوی بـــەخوڕی ئـــاڵی فرمێســـکی گـــوڕم

یـــا بـــەهۆی ســـەر شەوســـەرینی پـــێ بکـــا بـــەردێ نیـــە
یالەبـــەر بـــەربای خـــەزانی عومـــری کـــورت ســـاردو ســـڕم

یابـــە ڕووی جوانـــی بـــەهارو دەنگـــی هـــاژەو قەڵبـــەزەی
یـــا کەشـــەوگار ســـەخت و تاڵـــە یـــا بەخۆشـــی دولبـــەرم

یابـــە شـــادی گەرمـــە چۆپـــی یابەشـــینی ئـــەو دڵـــەی
خـــۆی لـــە جەســـتەی خـــۆی غـــەریب دێ دەنـــگ و هـــاواری زڕم

یـــا بـــەئاهی ناڵـــە نـــاڵی شـــەو کـــە پـــێی مـــات و کـــڕە
یـــا بەتـــەفرەی زۆر نـــەزانی بـــۆ ڕەقیـــب چـــەند هەڵپـــەڕم

یـــا بـــەنازو ناســـکی شـــۆخی تاوســـی خـــۆ دەنوێنـــی هـــەر
یـــا وەتـــەن دیلـــە کـــە هەرچـــەند کـــوێ بـــڕۆم چـــاو هـــەڵبڕم

یـــا بـــەکێوە بـــەرزە پـــۆڵای تـــۆپ شـــکێن دوژمـــن بـــەزێن
یـــا بەڕەشپۆشـــی پـــەری کـــورد جەژنـــە وا بـــەرزە گـــڕم

یـــا بـــەهۆی ڕەنـــج و خـــەباتی بەرهـــەمی ئەفســـانە بـــوو
یـــا بـــەگلکۆ ســـەر ڕاناگـــەم چـــەپکێ گـــوڵ بـــۆ کـــام بـــەرم

پاکی
٣/ ٩ / ١٩٩٦

## هـــەژار

هــەژار بــۆ تـــۆش بــڕاوە جــۆی پارەکـــەت گـــەر مــــاوە
لێـــــدە لــــە چەپڵـــە ڕێـــزان ئـــــەمڕۆ وەکــــو پـــــڵاوە

ڕمــــا خــــانووت بەســــــەردا کێڵگـــــەو بــــاخت ســــــووتاوە
کــــێ هەیــــە خوێـــن بڕێـــژی لـــــەتۆ زیــــاتر بــــەو لاوە

خـــەندەت نــــەدیوە ســــاتێ لـــــە ماڵتــــا شـــین و ڕۆیـــــە
برســــی و ڕووت و پێخواســـــی هـــــەردەم لــــە پــــۆلی دواوە

ســـوك و ڕیســـوای بـــەردەمی کــــوڕی هـــــەزار ناکەســــی
بــــۆر و پیــــــس و چڵکنــــــی قینــــــت لــــــە دڵ ڕواوە

ســــەری لولــــەی تفــــەنگت ڕوو لــــە ســــینەی براتــــــە
لەســــەر یــەك پــێ و بــــەر هــــەتاو دەڵــــێی زێـــرووت قــــووت داوە

بویتــــە دێوانـــــەی چـــۆلی ڕووت نـــــاوە بـــــە دەشـــــت و دەر
بـــەردە شـــــەوان ســــــەرینت ناکـــــەی قـــــەت بـــیری دواوە

هـــــەمووی بـــــۆ پارچـــــە نـــــانێ ڕەق و ڕەشــــی ســــــووتاوە
خـــــۆ لـــــە چڵپــــــاو وەردەدەی ســـــــەرت نێــــــو هــــــەزار داوە

کــــۆی منـــاڵ و خـــێزانت زینــــــدە بــــەچاڵ و وونــــە
شـــێوەت ڕەنـــگ زەرد و نـــەخۆش وەك پـــیری پشـــت چـــەماوە

بەشـــان و ڕەنجـــی تـــۆ بـــوو زۆڵ لـــە ســـایەت پـــاڵ کـــەوت
بـــوو بـــە خـــاوەن هـــەزاران کارگـــەو خـــانووی ڕازاوە

بـــەس ســـەیری لەمـــە خۆشـــتر هێشـــتا دەبینـــم شـــادی
دەڵـــێی مـــیر ســـەلامت بـــێ عومـــرم لـــە نـــوێ نووســـراوە

بۆیـــە منیـــش پـــڕ بـــە دڵ دەڵێـــم ڕاســـتەو وتـــراوە
(قالۆچـــە بۆنـــی گـــوڵ کـــا ژانـــە ســـەری بـــەدواوە)*

* * *

پاکی
٦ / ٦ / ١٩٨٣

*) لەپەندێکی کوردی وەرگیراوە٩٨٧ .

# ساقی

بــاری ئەمشــەو خــەم بەســەرما ســاقی زووکــە بم گــەرێ
کوپەڵــە مــەی چــەند هەیــە زوو بێنــە خــێرا بم دەرێ

مەســتی مــەی بم چاکــە توخــوا بــەردەوام نــا تاڵــە ژیــن
بــێ لــە مــەی پێــم چــاری ناکــا هــێزوکۆی هیــچ لاو بــەرێ

لێــم گــەڕێ بــا شــای خــەیاڵ بم تــاوێ ئــا لــەم قوژبنــە
شــەرتە ڕووی ڕۆژگــار نــەبینم تافەلــەك دێ وەرگــەڕێ

دەردی مــن قورســە بــەدەردی خــەڵکی سادەو ســوك نیــە
شــەو لەبــەر ناڵــەم نــەما کــەس بارنــەکا ونەچتــە دەرێ

دەردی هیجــران، دوور وڵاتــی و، بــێ وەفــایی کوشــتمی
هــەروەکو حــاجی لەغوربــەت ڕۆژێ دێ گیــانم بــەرێ

ڕۆژی مــن وەك جــەرگی شــەو وا ڕۆژێ دەڕوا لێــم بەســاڵ
وا لــە گێــژی خــەم دەدەم ڕوح کــەی دەکــەن چــارم ئــەرێ؟

پاکی
١٩٨٨/٩/٦

# رۆژگـــار

رۆژگــــــــاری رەش لــــــــەمێژە ڕاوی دامـــــــــاوان دەکـــــــا
تانــــــە بـــــۆ چاوســـــاغ و بۆکوێرمەرهــــــەمی چــــاوان دەکــــا

ڕۆژێ بۆهــــــــەندێ لـــــــە پێشـــــــەو ڕۆژێ بۆهـــــــەندێ دژە
ســـاتێ گـــاوان شـــا دەکـــات و ســـاتێ شـــا گـــاوان دەکـــا

دەیچــــەمێنێ پشـــتی شـــێرو بەکونـــە ڕێـــــری فیــــل دەبـــا
پـــــردە بــــۆ نـــــادان ومـــــەردان دیلـــــی ســــەد داوان دەکـــــا

دەی وەرێنـــــێ گـــــوڵ لـــــەباخ ونەونـــــەمام دەشـــــکێنتەوە
لاس ودڕك و، داڵ دەنەخشـــــێ زورگ وخـــــار، پـــــاوان دەکـــــا

پـــێی بڵـــێ بۆهێنـــدە عەکســـی؟ ســـەرهەڵێنە پێـــت دەڵـــێ
هـــەرچی ڕووی ئـــازارە هێرشـــی ســـەر ســـینەی پیـــاوان دەکـــا

پاکی
٦/٦/١٩٧٨ / کۆیە

## کڕنوشم بەڕووتا

بەکۆڵێ تاوان سوجدە وکوڕنووشم
بۆهێنای بەڕووت گەر نی‌یە رووشم

وام لەخول وگێژی پەلەی خنکام
لەدەریای قولی کە بووە بەتووشم

جەستە دیل وبەند یاساش بەرەڵا
نێرە و حوکمیشە دەبێ بیدۆشم

راستی پۆشراوە سواغە بەتاوان
دەڵێن ئاشتی‌یە و دەبێ بیپۆشم

کۆی گشت گرانی یە هەرزان بێ گیانە
ئەویش کەس ناکڕێ هەرچەند بی‌فرۆشم

لەم هەزار هیواو لەمن هیوا یێ
ئەویش گێتی یە بچێ لە هۆشم

کردەو نەکردەم هەردوو تاوانە
جا سەر بەکوێ بەم نازانم خۆشم

سەیرەپێم خەییام سەرگەرمی مەی بوو
پێ مەست نابم مەی جیهان بنۆشم

چاتر بێ لەخۆم خۆزگەم بەخۆم بەس؟
ونم وەك شیعری ناسك و پڕ جۆشم

١٩٧٨/١٠/٦

## تــاوێ

بــــــــابژین تــــــــاوێ ئێمـــــــــەش بۆخۆمـــــــــان
ســــــودی چـــــی بـــــوو شـــــین، خـــــەم، دادو رۆمـــــان

چیمـــــــان بـــــــەچی کـــــــرد کوانـــــــێ بەرهـــــــەمی
نوســـــــیمان شـــــــیعرو چـــــــیرۆك و رۆمـــــــان

هەردەســـــتەو ئـــــەژنۆی جـــــەفاو حەســـــرەت بوویـــــن
لـــــــەجیاتی شـــــــادی پـــــــەیدا بـــــــێ بۆمـــــــان

نەشـــــێخ نـــــە ئاغـــــە نـــــەمیر گـــــوێی نـــــەگرت
لـــــــەزگی دەهۆڵـــــــی برســـــــی بـــــــەدۆمان

زانامـــــــــان بـــــــــەندەی دوودواکەوتـــــــــەبوو
ئەمـــــــەش بۆهـــــــەرەس یـــــــەك بـــــــوو لـــــــەهۆمان

زانســـــتمان جـــــەنگ بـــــوو بۆیـــــە وەك مریشـــــك
هەرتەنـــــها خۆڵمـــــان کـــــرد بەســـــەرخۆمان

بـــــۆ لایـــــێ هەریـــــەك مـــــەڕی بـــــێ شـــــوانین
بۆیـــــە وابـــــڵاوی دونیـــــا بوویـــــن کۆمـــــان

پاکی
١١ / ١١ / ١٩٨٦

## ڕۆستەمی داماوە
## پێنج خشتەکی شیعری پاکی

داخی زۆر زوڵم و ستەم بوو، بووم بەئاوارەی وولات
نارەوایی ودەستی ڕەش بوو خەڵکی ناچارکرد هەڵات
خوێنی ئاڵی جەرگی خۆم بوو هەرلەناو کاسەی خەڵات
کێ چرابووکوا نەمان دی کەس لە پشتمان بێ قەڵات
کاروکرداریان وەها بێ چۆن بڵێم ئاسۆ هەڵات؟

* * *

هەر لەڕۆژی زوو بەبۆنەی پێشڕەوو سەردارەوە
کەوتنە دوای گەنجی نەزان ولاوی گوند و شارەوە
باسی ماف وقەومی کوردت بۆ دەکەن سەربارەوە
بەس لەڕاستی وەك مۆرانەن چوینە جەرگەی دارەوە
بۆیە ڕاکە خۆی بەدڵسۆز دەربڕی گەرهات بەلات

* * *

شەو لەیانە مەستە بۆخۆی هەم لەگەڵ یارانەوە
گەرمە باخەڵیان چ باکیان بێ بەباو بارانەوە
ڕۆستەمی داماوە شێرە بۆدزی و تارانەوە
بووینە خوێن ڕێژی هەژارو تجری شارانەوە
داخی وان بۆیە لەدڵما سەنگی زۆرە وەك قەڵات

* * *

مـــــالْ ومندالْیـــــان دیـــــــــاره وا لەجەرگـــــەی ئەوروپـــــــا
پـــــول وخشـــــــــلْ وزێـــــڕی زۆره هەر لەسەرێـــــا تاکو پـــــا
خـــــۆی پەســـــاپۆرتی لەباغـــــەلْ هـــــەردەمێ بۆی رابـــــکا
باکـــــوڕی خەڵکـــیش بکـــــــوژرێ سەربڕێ وەك گـــۆلك وگـــــا
کەخـــــۆی ئەمـــــڕۆ فـــــیرعەونێکە چـــی بەدوێنێ ، بوو گەداولات

* * *

چـــــاك دەزانم هـــــەندێ پەســـــتە لـــــەم قســـــەو واتانـــــەوه
چونکـــــە ڕاســـــتی دەربڕینـــــە ڕوو بـــــە ڕووی رووتانـــــەوه
کـــوا چیتـــان کـــــرد بۆشـــەهیدان چـــوون لـــەپای ڕێتانـــەوه؟
چـــەند دەنـــۆڕم خۆشـــــی نایـــێ شـــــك بـــەرم پێتانـــەوه
تـــا لـــە دەســـتان خـــێر بـــەدی کـــەم هـــەر وەکـــو نوقـــلْ وبـــەرات

پاکی

١٩٨٤/٥/٩

# دڵ لەت دەکا(*)

چـــــۆن دڵ لـــــەت دەکــــــا دەردی غوربــــــەتی
ئـــــای لـــــەو ئـــــازارە ســـــەختەی هەیـــــەتی

لـــــەو چرکـــــەی کـــــەوا چـــــاوم هـــــەڵێنا
بـــــوو بەهاوســــــەرم کۆیلـــــەو مەینــــــەتی

ڕووی خـــــەندەم نـــــەدی هـــــەردەم بـــــێزاربووم
لـــــە رژێمــــــی تـــــورك و، فــــارس و، پیێپــــــەتی

لـــــەڕۆی جـــــەژنا زینـــــدە بـــــەچاڵ بـــــووم
خـــــەڵاتم هـــــەردەم قـــــەنارە و پـــــەتی

ڕوو لـــــەکام لاکـــــەم کـــــەس بـــــەخۆم نـــــاگرێ
لـــــە ڕۆژی رەش بـــــۆ فریــــا و یارمـــــەتی

نرخـــــم نـــــەمابوو ســـــەرم وەك گـــــۆ بـــــوو
بۆشـــــەقی ناکـــــەس هـــــێرش وهەڵمـــــەتی

ناچـــــاربووم بۆیـــــە خـــــۆم ئـــــاوارە کـــــرد
بچێـــــــــــژم دادو ئـــــــاهو حەســـــــــرەتی

پاکی
١٩٩٧/٨/٧

(*) ئەم پارچە هۆنراوەیە لەلایەن بەرێز کاك سالار سلمان کزاوە بەگۆرانی ئەئێستا لە هوڵەندا دەژی.

# خەم باری یە

چاوهەڵێنـــە چـــۆن لەبـــەختم ڕۆژو شــەو خـــەم بـــاری یـــە
نارەوایـــە هـــەرچی بیکـــەم بـــێ لەشـــین زۆرداری یـــە

هـــەڵ پـــەڕینی چـــی لـــەپای چـــی تـــازە کـــاروان تـــێ پـــەڕی
نیوەڕۆیـــە هـــەر لـــە خـــەودام شـــەرمە شـــەرمەزاری‌یە

بولبولێکـــی باڵشـــکاوی تـــاوێ دەســـت ئـــەم یـــا ئـــەوم
هـــەرچی دەســـتی دا لـــە پشـــتم بـــۆ گەمـــە و بـــۆ یاری‌یـــە

خـــەڵکی ســـاڵی نـــوێ کـــە دادێ تـــاج و، گـــوڵ دەکـــرێ خـــەڵات
مـــن نـــەبێ کاســـەی ســـەری خـــۆم هـــەر لـــە ڕێـــی بـــۆ دیاری‌یـــە

تـــابزانێ خـــەڵکی دونیـــا چـــەند پەشـــێوە حـــاڵی مـــن
قورســـە دەردی مـــن لـــە خوێـــن و، جـــەرگ و، ئێســـکم کاری‌یـــە

جـــا لەگـــەڵ شـــادی بـــە قوربـــان ســـەختە زۆر مـــن هـــەڵ بکـــەم
ئـــەو بـــە خـــەندە و مـــن کـــە پیشـــەم شـــین و، گریـــە و، زاری‌یـــە

پاکی
١٩٨٨

## هەروێرانە

هــــەر ســــوتاوە هــــەر ووخــــاوە هــــەر وێرانــــە شــــاری مــــن
هــــەر کوشــــندە و ترســــناك و ســــەختە زۆر ئــــازاری مــــن

روو بــە چــەرخی بیســت و یــەك چــووم کــوا پلــە و پایــەم چیـیــە؟
بــەردەوام لــە شــکانە هــەردەم رۆژ بــە رۆژ بــازاڕی مــن

هــەندێ جــار بــۆ خــۆم لــە خۆمــا بــاوەڕت بــێ دژ بــەخۆم
بــۆ ئەمــەش بەڵگــە کــە تێکــەڵ بــە رۆح بــووە بــێزاری مــن

زۆر هــەبوو دوێنــێ بــە شــۆڕش راپــەڕی و ئــەمڕۆ کــەچی
ســەربەخۆ بــوو بــەس نــەبوو چــار بــۆ دڵــی زامــداری مــن

خــاوەنی خــاکی بــەرین و ســەر شــەقامە نووســتنم
بۆیــە روو زەرد مــاوم حــەزکا کــەس نــەبوو ڕووخســاری مــن

چــاری ناکــا زامــی قوڵــم هیــچ کەســێ هــەر خــۆم نــەبێ
گاڵتەیــە پێــم هــەر چــی دەکــرێ نــابێ قــەت ســووك بــاری مــن

بــاوەڕت بــێ ڕۆژی رەشــتر دێتــە پێــش ســەرمان هــەتا
گــۆ ببێــتن چــەق لــە مــەیدان بــۆ شــەقی زۆرداری مــن

هــەوری کینــە تــا لــە دڵمــان گرمــە گرمــی بــێ و هــەبێ
هــەر دەبــێ فــەرهادی وێــل و قــوڕ پێــوان بــێ کــاری مــن

دایکــــی ڕەش پــــۆش هـــات چریکـــەی ئاسمـــان گریـــاو کـــەچی
بـــۆ یەکیـــەتی یـــەکیان نـــەگرت گوێیـــان نـــەدا هـــاواری مـــن

پاکی
١٩٩٤/٨/٦

# تـــــــا مەحشــــــــەر

هــــــەر دەبـــــێ چـــــاوە چـــــاوی هـــــەڵدێر بم
هــــەتا کــــەم ژیـــــرێ بۆمــــن هــــەیاس(*) بــــێ

هــــەر دەبــــێ تۆپـــــی بــــەرپیّی ئەوئـــــەم بم
تاســــەر قوربــــانی دوو پــــیرو ئـــــاس بــــێ

ئـــــەبێ هــــەر برمــــێ کۆشـــــکی ئـــــازادیم
تــــاپول بناغــــە و بـــــەرد و ئەســـــاس بــــێ

ئـــــەبێ هــــەر لوقمــــە چـــــەوری نێـــــو دەم بم
هــــەتا شــــوان گورگــــی برســــی و دەم راس بــــێ

ئـــــەبێ هــــــەژار و هــــــەر دەربــــــەدەر بم
هــــەتا خوێنــــی ئــــاڵ پێکــــی نــــاو کــــاس بــــێ

ئـــــەبێ هــــەر قــــور بــــێ نەجمــــەی ســــەر شــــانم
شــــاباش هــــەتاکو دەشــــتی باتــــــاس بــــێ

ئـــــەبێ هــــەر ریســــواو بتوێــــم هــــــە تــــاکو
ســــەنگەری ناحــــەز کێــــوی ئـــــاراس بــــێ

پاکی
(١٩٩٧)

---

هەیاس/ لێرەدا واتە ئەیاز بۆ سوك و تنی هۆنراوەکە کراوەتە هـەیاس. کـە راوێژکـاری سـوڵتان مـەحمود بـووە زۆربە کاراو لێهاتوو زیرەك و زانا بووە لەو سەردەمەدا.

# بۆ ئازار

بۆ ئازار هیچ کەس نەبووە هاوسەرم
هەر دڵەی خۆم بوو قەبری کەسەرم

لە مە حاڵی بووم بۆیە بە نیشان
کەسێکم نەکرد هانای بۆ بەرم

بەلاَم ڕووی گەردوون چەقیم بۆ سەختی
چەند بە لێشاو بوو هێرشی بۆ سەرم

چونکە دەم زانی ڕەوشنی چۆتە
ڕەقە بۆ زانا و بۆ نەزان نەرم

دۆستی ناکەسە و بۆ دەنی پشتە
بۆ ژیر سپڵە یە و هاوڕێی بێ شەرم

بۆیە هەند تواوە شێوای مەینەتیم
لە ژین هەست ناکەم بە ساردیو گەرم

کاری وادەکا تیا دینە زانا
جۆ نەبێ بۆ من برنج بۆ کەرم

کاتێ هاتمەکا پاک وەك پەپولە
دەچمەوە بەرگی ئاگرە لە بەرم

بۆیـــــــە ســـــــورڕماوم ئایـــــــە بـــــــۆ هـــــــاتم؟
چـــــــی بـــــــوو ئاکـــــــامی مایـــــــەی ســـــــەفەرم

پاکی
١٩٩٥

# ئـــازار

هـــــەرچی چـــاندم بـــــووْ بــــە ئـــــازار بەرهـــــەمی
بـــــۆ یـــــە کوێخـــــای ڕوومـــــە ئـــــەمڕۆ ماتـــــەمی

چـــاك دەزانم خـــــۆم بـــــە تەنـــــها چـــــی کـــــەپێم
کـــــرد لـــــەناکاو داوی زولـــــف و پەرچـــــەمی

مـــــن هەڵـــــەم کـــــرد نـــــەم دەزانـــــی پـــــەندەکا
کـــــاتێ بیبـــــەم لێـــــوی برســـــیم بـــــۆ دەمـــــی

ڕاســـــتە کـــــەی ســـــووتان بـــــەدۆزەخ هـــــەردەبێ
جەســـــتە بـــــێ ســـــووتاوە ســـــەرجەمی

ژیـــــان بەهشـــــتە کوانـــــێ ئـــــازاری تیـــــا
یـــــار بکـــــا چـــــار زام بەپەنجـــــەی مەرهـــــەمی

ســـــەختە تـــــوش بوونـــــی پـــــەژارە (پـــــاکی) یـــــەك
تـــــۆی لەپشـــــت بـــــێ و نەبیـــــە کۆســـــپی بـــــەردەمی

پاکی
٥/ ٥/ ١٩٨٥

# وێنەیەك

وێنەیـــەك بگـــرە بـــەقوربان تـــاكو هـــەی بـــۆ رۆژگـــار
خۆشـــە وێنـــە دوای زەمـــانێ ســـەیری كـــەی بـــۆ یادگـــار

هـــەر بەوێنـــەو كـــار ونـــاوە كـــارو نـــاوە بكـــرێ باســـت جـــارو بـــار
تـــا كـــو ڕابـــردووت بمێـــنێ دەوڵەمـــەند بـــی یـــا هـــەژار

بـــای رەشـــی مـــەرگیش هـــەموو دەم هـــەر لـــە دووتایـــە بـــەغار
تـــۆش لـــە ژێـــر خاكـــا دەبیتـــە خواردنـــی دوپشـــك ومـــار

ئـــەم زەمانـــەش پـــڕ جەفایـــە رۆژ بـــەرۆژ خۆزكـــەم بـــەپار
چونكـــە دۆســـــتی بـــێ وەفایـــە وەك یەكـــە لای ژێـــر وهـــار

هـــەر دەبـــێ بمـــری بەخـــەم بـــی یـــا هـــەبووی سەد كۆشـــك وتـــار
جـــا كـــەوابوو هەســـتە بگـــرە وێنەیـــەك بـــۆ دۆســـت ویـــار

پاکی

٨ / ٨ / ١٩٧٨

ئەم پارچە هۆنراوەیە لەلایەن هونەرمەندی بەڕێز وخۆشەویست عـارەب عوسمـان کراوە بەگۆرانی .

# بۆ ئازادی

لــــــه وێنــــــەمدا كــــــه دەڕوانـــــــی وامەزانــــــه كـــــــه ئـــــــازادم
لــه ســەر هـــێزم وەكـــو پـــۆلاً لـــه بـــۆ بێســـتون كـــه فـــەرهادم

ئـــەوەی دوره لـــــەزام جـــــەرگی دەزانـــــیٚ وا كـــــەدڵ شـــــادم
بـــەلاّم دورم لـــــه ئـــــەم شـــــێوه بەئــــەم شـــێوه بكـــەن یـــادم

هـــــەژارێكم كـــــه ژینـــــم پــــڕ لەناســــــۆر وجـــــەفا ودەرده
هـــەموو خۆشـــیم بـــه قوربـــانی گەلێكـــه وا لـــــه ئـــەم هـــەرده

بـــــەنانی رەق لــــــەبۆ مـــــافی ئەجـــــەنگیٚ وا لـــــەپاڵ بـــــەرده
منیـــــش بۆیـــــه گرفتـــــارم بـــــۆ ئـــــازادی، كـــــەڕووم زەرده

پاكی

كۆیه ٧ / ٧ / ١٩٧٧

# گــوڵ

کـــــەدیم گـــــوڵ گوڵـــــەو گوڵیـــــش دەفرۆشـــــی
کـــــەوتم لـــــە تـــــاوا زۆر بـــــەبێ هۆشـــــی

کـــــەچاوی کـــــردە چـــــاوم بـــــەجارێ
ئـــــەو دەم هەســـــتم کـــــرد بـــــە دونیـــــای خۆشـــــی

کەدەســـــتی ســـــاردو لـــــەر زۆکـــــی گـــــرتم
لـــــەپڕ بـــــە تاســـــەو ســـــۆزی پـــــڕ جۆشـــــی

ئـــــەو دەم بەهەشـــــتم دی بـــــە ئـــــەو دەمـــــە
کـــــەچوو ئـــــازارم لێـــــم بـــــە ڕووی خۆشـــــی

ئیلاهـــــی ســـــەرم ســـــوڕما کـــــە کامیـــــان
بکـــــڕم گـــــوڵ لەدەســـــت یـــــاگوڵ لەکۆشـــــی

نـــــەڕەنجی خوایـــــە لـــــەمن ئـــــەو شـــــۆخە
نـــــەڵێ هەڵـــــەت کـــــرد چـــــاو لێـــــم بپۆشـــــی

پاکی

١٩٨٥ کـۆیە

## قەدەم

بانـــەبم دڵگــــیر مەپرســـە بـــۆ کەســـووتای ئـــەو قـــــەدەم ؟
چونکـــە مـــن هـــەر خـــۆم دەزانم چـــی بـــەمن کـــردووە قـــەدەم

وەك خـــدر ئـــاوی حـــەیاتم نـــۆش دەکـــرد جـــاریَ ئەگـــەر
ئـــەو بـــە لوتفـــی هاتبـــا پێـــش ڕووی بـــە قـــاپیم یـــەك قـــەدەم

مـــەم دەنـــە بـــەر توانجـــی شـــەرمەو لۆمـــە هـــا ســـێبەر بـــە دووی
مەرهەمـــە بـــۆ چـــاوی کزمـــا تـــۆزیَ ژێـــر پـــای دوای قـــەدەم

مردەیـــی دەم تـــەنگی خونچـــەی تـــازە نیـــم بـــۆ ڕووی کـــەڕووم
شـــەق شـــەق و ســـووتاوە ڕەش وەك پـــەلکی داری ئـــەو قـــەدەم

ســـا دەخیلـــە مـــن کەکوشـــتەی تیـــژە مـــوژەی نیـــم بـــەهۆی
چـــی زراو تربـــووە لـــە داوی زولفـــی دووی ڕەش ئـــەو قـــەدەم

زیندەگیـــم لیٚ بۆتـــە دۆزەخ بۆیـــە ڕۆژو شـــەو منـــم
وەك چـــرای دز وا بـــە مـــەخفی پێکـــراوم شـــەوقەدەم

مـــاڵی ئـــاوا دەك نـــەبیَ دڵ بـــیَ وچـــان بـــیَ ئۆقرەیـــە
بۆیـــە وەك ڕاوچـــی غـــەزال بـــۆی هـــەر لـــە بنـــاری ئـــەو قـــەدەم

پێـــم دەڵێـــن هـــەر دەرد و چـــاریَ ڕاســـتە گـــەر ئـــەی کـــوا بـــەمن
ناســـکە شـــۆخیٚ کـــا تیمـــارم وەك فریشـــتەی خـــۆش قـــەدەم

کوا چریکە و سۆزو ناڵەی بولبولی شەیدا بەگوڵ
دێ بە ناڵەم وامەزانە بۆ دەمێ دەم تەوقە دەم

خۆزگە دووری شەوق و کلّپەی بایە وەك ئەستێرەکان
تاکو حاڵی جەستەکەم بای چۆن لەسوتان بووە قەدەم

بوون و یادی تۆ بوو بوونم تۆش کەڕووت کز بوو بەڕووم
هەر بەجارێ کێوی هیمەت لێم ڕووخا شکایێ و قەدەم

دیت لە هەر کوێ کۆڕێ ماتەم دوور نزیك ساز بۆ منە
ژێر بەلاّ بەو حاڵە چ بڵێم ڕەشبەڵەکمە و زەوقەدەم

خۆش بوو دڵ وەك ئاوێنەك با ڕوانی بای یارم هەتا
چۆن بەخەندە زامەکانی یەك بەیەك پێ سواغ دەدەم

من پیادەو سەر فرازی و یار بروسکەی خۆش ڕەوە
بیگەمێ چۆن ؟ نایگەمێ چەند هەوڵ و ڕاکەی بۆ دەدەم

هەر لەکاتی بوون کەچاوم کردەوە بۆ چاوی مەست
جا کە ئەمڕۆش چوم بەسالاّ ئەم خووە چۆن بەردەدەم

ناحەزان وەك هەوری ڕەش وان ڕێگە دەگرن لێم بەلاّم
تێ بگەن وەك بای بەهێز وام ئەم گەوارەش ڕا دەدەم

وەك حوسـەینی کەربـەلا بـا خوێنـی (پـاکی ) بـڕژێ یـا
بـێ لـەملما کەزیەکـەی تونـد کـا هـەتا ڕوح پـێ دەدەم

پاکی

**نەورۆزی ٢٠٠٠**

# زۆر گەڕام

هەوڵی زۆرم دا خەمی دڵ ناڕەوێ
زۆر گەڕام و چووم بە ئەولا یا ئەوێ

کاتێ هەستم کرد لەناڵەی تێی گەیم
سەر بەسینە و بۆنی جوتێ بەی دەوێ

چاکە چبکەم من عەزیزم بەو دەمە
ئەو دەمە بۆم بەودەمە چۆن ڕێکەوێ؟

شێتە نێرگز کوا لە زستانی سەخت
جەستە بێ گیان ڕوحی شیرینی دەوێ

باوەڕت بێ بستێ دوور کەوتی لەیار
چەشنی دۆزەخ وایە ئێرە یا ئەوێ

دای کوتا ڕیشەی ئەڤینی گەر لە دڵ
ناچێ تیری سەد قەزای گەر پێ کەوێ

قەت چ ناکرێ پێم لەگەڵ بەختی سیاه
چیم بەدەستە کێ هەیە شادی نەوێ؟

پاکی
٢٤/ ٧/ ١٩٨٩

# عەشقی پیرۆز

تا بڵێی لێك دوورین کاتێ دەڕوانین
کەچی ڕێبواری ڕێی یەك کاروانین

بەڵام خونچەکەم لەعەشقی پیرۆز
لادەین باوەڕکە خاوەن بڕوا نین

ڤینۆسی ونی ڕۆژو شەو هەڵ دێین
نەشئەی بای وەفای دەستی دڵدارین

ڕیشەی نەمامی دڵ یەك چەقیوین
سەداو ئاوازو شیعرو گۆرانین

خرۆکەی خوێنی ئاوێتەی یەکین
پۆخ و چرۆو گەڵاو توێکڵ و دارین

وەك مانگی ژێر تەم کاتی لێك دوورین
زام و هەتوانین لەیەك تۆرانین

تانەی سەرچاوی کۆی نەیارانین
بۆ وشکی ڕووی یەك پەرەو بارانین

پاکی
٧/ ٩/ ٢٠٠٠

## دەچمەوە[1]

دەچمەوە باوەش ولاّتم رۆژێ دێ بۆی نابەزم
چاوە دێرو پاسەوانی هەردەکەم باخ و ڕەزم

سێوە سورەو خۆخ و هەرمێ و هەم هەناری نازەنین
چەند بەتام و شیرن و خۆشە هەر وەکو ڕووی نازەنین

باغی هیران هەیبەت سوڵتان، سەرقولە، هەم سەرچنار
هەرپەرستگای ئەو دڵەم بێ شەرتە وەك بالاّی چنار

بۆنی شەوبۆو شلکە ڕەیحان هەم کنێرو یاسەمین
زەردو یڵەم دوای بەوێنەی خاڵی گۆنای یاسەمین

سەوزە دەشتی چەشنی مافور پڕلەگوڵ نەخش و نیگار
سوێند دەخۆی هەر تازە شانە کراوە وەك زولفی نیگار

ژێر تریفەی مانگە شەوبێ دەست لە مل کەی نێو چیمەن
بۆن شەمامی زەرد و سور بێ هەر وەکو سینەی چیمەن

مەست بمێنی خۆشە داماو سەیری هاژەی تاڤگە کەی
تاوە تاوەش مەرهەمی زام هەر بە پەنجەی تاڤگە کەی

---

( ) ئەم شیعرە بلاّو کراوەتەوە لە ژمارە (٧١)ی گۆڤاری بێوار ساڵی ٢٠٠٢ (بێوار: گۆڤارێکە لە ڕوتردام مانگی جارێك دەردەچێ کە بابەتی کۆمەلاّیەتی و ڕۆشەنبیری یە بلاودەکاتەوە).

مەیلی چۆپی ڕەش بەڵەکمەو بەزم و های (ئۆمەر خوچان)[٢]
یادی مەستی پێکی دەستی شەنگەبی بالآی کچان

خۆشە سەیرانی بەهەشتی ڕوو ئێوارە و دەم بەیان
سەختە ژانی دەردی دووری و باوەشی گەرمی بەیان

سۆزی قاسپەی کەو لەشاخا بۆی بەقوربانە کەمان
خوایە رزگاری دەبێ کەی ژێرەپای هیچ و کەمان

ڕوو پەشێوی دەردە مانم سەربەسەر ژینم خەیاڵ
سینەکەم کون ڕەش بەقەتران، ڕەش وەکو چاوی خەیاڵ

بەردی یاقوت و پزیشکە کۆی هەوای سەر ڕووی جیهان
بەس بەمن چی دیل بە وێنەی تاقی دوو ئەبرۆی جیهان

پاکی
٢٠٠٢ / ٨ / ٧

(٢) **ئۆمەر خوچان**: شوێنی سەیرانگای کۆیە بوو کە خەڵکان ڕۆژانی جەژن و هەینی ڕوویان تێ دەکرد ودەمانەوە هەتا ئێوارە بەخۆشی و هەڵپەڕکێ و گۆرانی و شایی کردنەوە کاتیان بەسەر دەبرد.

# شێواوم[٣]

نازانم چۆن دروست بوی هەر چەند بیرت لێ دەکەم
شێواوم وەك پەرچەمت بۆ هەر کام لا ڕێ دەکەم

شێتە کەسێ تۆی هەبێ بچێ لەمەی ڕووبکا
مەستم بە مەستی چاوت پێك لەسەرپێك تێ دەکەم

شێوە پەری دەم خونچە لەنجەت کۆتری بەرماڵ
فیدای تۆزی بەرپاتم بۆیە لەدوات ڕێ دەکەم

وێنەی یەکێ دڵ دزراو بێ هۆش کەوتوم لەکوچە
سەرگەردان وێڵم بەدوات دەڕۆم هەزار جێ دەکەم

ئەزانم تۆ لەخواوە ڕوو ئارایش بێ چرای
چرای دڵەی تاریکم شەو چرا چۆن پێ دەکەم

بەناز کەوتوی لەولاوە نیە نازت بکێشێ
بۆیە ڕەنگ زەرد لەخۆما شێوەی سەد بەهێ دەکەم

[٣] ئەم پارچە هونراوە بلاوکراوەتەوە لەرۆژنامەی برایەتی.

وامەزانـــــــە مـــــــن شـــــــەیدای چاوکـــــــاڵانی ئـــــــەوروپام
هـــەمووی قوربـــــان یـــەك خـــەندەی شـــۆخی شـــیرنی دێ دەکـــەم

بـــا نـــەڵێن بـــێ وەفـــا بـــوو (پـــاکی ) هیچـــی بـــۆت نـــەکرد
هـــەژارم هـــەرگیانم هـــەس شـــەرتە بـــۆت ژێـــر پـــێ دەکـــەم

پاکی
١٩٩٨/٢/١٧

# نۆباغی شار

سەر شێواوم چی بنووسم باسی ئێستات یانە زووت
لار و لەنجەت ، ناز و خەندەت ، قەد و باڵآت لالەی ڕووت

هێندە سەرقاڵی ئەڤینتم گەر لە ساتێ سەدکەڕەت
بیمە قوربان هیچە بۆ یەك زەرد گەڵآی ژێردار بە ڕووت

تۆ کە ڕوو نۆباغی شاری بەس عەزیزم چی بە من
بێ بەشی خاڵی گۆناتم لەو هەموو جوانیەی کە بووت

داخی جوانیت هێندە زۆرە تاجیهان هەی دەربڕم
شەرمەزارم چی بنووسم نایێ شەڕحی خاڵی ڕووت

واگریم شەو تاکو ڕۆژ هات چۆوە ڕۆژ شەو هاتەوە
وەصفی تۆم کرد چی بوو مایەی بۆ منی داماوی ڕووت

سینە خۆش بوو بۆت کەرێ بێ پێ لەجەرگم تابنێی
سوك بێ ئێشی تا بە نوکی کەعبی بەرزی هاتو چووت

هەی بەهاری چوار کڕی ڕووم سوکە ئاورێ کەی دەدەی
تۆ لە ناڵەی من کە دەخشێم هەر وەکو ساوا لەدووت

کەی دەبێ ڕەحمێ بەئاهی سەردی من کەی وامنم
خەستەبێ هێز مات زراو کز ڕەش بە وێنەی داوی مووت

خـــۆت مـــەڵاس داوە لـــە (پـــاکی ) گوایـــە بـــێ ســـــوچی بـــەڵام
تـــۆی لـــەژێر وا تونـــد دەدەی جـــۆش ئـــــاگری گیـــانم بـــەفووت

پاکی

١٩٩٨/٢/٢

# فریشته

چیـم لـە کۆشـــك وپـــول و باخـــە بۆنـــی گۆنـــای تـــۆم هـــەبێ
جوانـــی وەك تـــۆ کـــوا لەعالـــــەم کـــێ دەڵـــێ لای ڕۆم دەبـــێ

وەك فریشـــتەی بـــێ خـــــۆراك و خـــەو بـــەزیکری تـــۆ منــم
کـــێ بینـــای چـــاوی لـــەڕێتا چـــوو ئەگـــەر هـــەر خـــۆم نـــەبێ

بـــەفری ســـەر چیـــای بـــەر هـــەتاو کـــوا کـــەم دەکـــا ڕێـــژەی بـــەمن
ئـــەو هـــەتا دەتـــوێ زوخـــاوم دێ بـــە قـــەد دووگـــۆم دەبـــێ

چـــــاوکراوەی دەردو ژانم ڕاســـــتە بـــــەس مـــــاوم عەجـــــەب
جەســـتە تاکـــەی دەتـــوێ بـــێ دەنـــگ مـــات بـــە چەشـــنی مـــۆم دەبـــێ

نـــەرمی ناکـــا قـــەت عـــەزیزم ئـــاهی ســـەردی مـــن دڵـــت
نـــەم دی لاو بـــوم چـــۆن دەبینـــم ســـاتێ پشـــتم کـــۆم دەبـــێ

مـــن بـــەهیوای وەســـڵی شـــادی و ڕاکـــە ڕاکـــەی خۆشـــی بـــووم
نـــەم دەزانـــی تـــاڵی ئـــەمڕۆ بەرهـــەمی ئـــەمڕۆم دەبـــێ

گـــەر زەمانـــە (پـــاکی ) لـــەدوات ئەســـپی نەگبـــەت تاونـــەدا
هێنـــدە بـــۆ لەشـــکانی هـــێزو پشـــت و دوو ئـــەژ نـــۆم دەبـــێ

پاکی
١٩٩٨/١/١

## زولفەکەت

زولفەکـــەت بـــۆ خـــۆی شـــێواوە یـــاتێکی ڈاوە شـــنە
ئـــای کەجوانـــە لێـــت لـــە دولا مایـــەی خـــۆش بـــەختی منـــە

ســـەیرە هـــەرچی دێ لـــە بیریـــا بـــۆت خـــەیاڵێکی هەیـــە
ڕاوی تـــۆش ئـــالۆزە بکـــرێ لـــەم کـــەژو زورگ و بنـــە

ڕاوچـــی لاو چـــاکم گـــەڵێ دی بـــوو بـــە نێچـــیر خـــۆی گـــلا
تـــۆ کـــە هێشـــتا پـــات نـــەگرت بـــوو فـــێری بـــەو ڕاو کردنـــە

هـــەر پـــەڵێ تیـــژ بـــوو ســـیامند چـــوو بـــە ســـینەی بـــۆ خـــەجێ؟
وەك ســـەرەد ســـینەم بـــەتیری عەشـــقی پـــاکی تـــۆ کونـــە

چاکـــە ڕەحمـــێ تـــۆ بـــەحاڵی خـــەڵکی کـــەی کـــەم کـــەی گـــوزەر
چونکـــە هـــەر جـــەنگی قوربـــانی ڕێتـــە بـــۆ ئـــەم دیتنـــە

جانـــە لایـــێ ڕوو دەدەی پێـــم لایـــێ دەگـــری ڕوو لـــەمن
هـــەر دوولا ڕازیـــم بەمـــەرجێ تـــەرکی ئـــەومان گرتنـــە

جوانـــی بیـــانی ســـاردە شـــیرنی کـــوا لـــە ئاســـتا بـــێ بـــەتۆ
کـــۆی بـــەقوربان شـــۆخێ کـــاتێ ســـەر چیـــای مـــازی چنـــە

تـــۆزە گۆشـــتێ پـــێی دەڵێـــن دڵ ســـا بەشمشـــێری بـــڕۆت
بـــۆت نـــەبێ ڕاکـــە بـــە وێنـــەی ســـەد ڕەقیـــب بـــی ئەنجنـــە

وێڵـــێ چەشـــنی (پـــاکی ) قوربـــان دەر بـــڕێ چـــی پێـــت کـــەمێ!
لایـــەقت بـــێ وەصفـــی نـــاڵی و شـــەنگە بـــێری هێمنـــە

بـــەردی ژێـــر گڵکـــۆش عـــەزیزم بۆنـــی تـــۆی پێـــوە نـــەبێ
لای نـــەدەم بـــەخوا لەســـەرما شـــەرمە ســـەد جـــار مردنـــە

پاکی
١٩٩٩/١٢/١٢

## دینه

دینـــــه هـــــەرچی پێـــــت دەڵــــێ تــــۆ نــــی پــــەری
لای بــــــەرن بــــــەرچاو نـــــــەبێ بــــــا دەر پــــــەڕی

چونکـــــه بـــــەس تەنــــها پـــــەری نـــــی و شـــــای پــــەری
ئـــــەم دەمــــەی تــــۆم دی بــــه کــــــوردی لـــــەو بــــەری

ســــــەیره مـــــــردوو چـــــــۆن ســــــەما ناکــــــا دەمـــــێ
دەســـــــت بـــــــه دەسمــــــاڵ چۆپیتـــــەو هـــــەڵ دەپـــــەڕی

یــــــەك نیگــــــای گــــــەر دڵ کوژیـــــت بـــــەخوێنی ئـــــاڵ
دەســـــــت کــــــەوێ کــــــێ بـــــێ لەمـــــــەیدان نـــــەتکڕی

چــــــەند فریشــــــتەی بـــــوو بـــــەکۆ بـــــۆ ســــــەیری تـــــۆ
دیـــــــم لـــــــەداخت چـــــــۆن یەخـــــــەی خۆیـــــان دڕی

ســـــوێند بـــــه بـــــالأی چەشـــــنی ئـــــالأ بـــــت پەرســـــت
جـــــێی بەهەشـــــته تـــــۆی لەگـــــەڵ بـــــێ مەحشـــــەری

بــــەس لـــــه چــــاوی پـــــڕ لـــــــه فێــــڵ نیــــم دڵنیــــا
کــــــەی بـــــۆ قــــــەتلی ســـــــەردەدا فتـــــوای شــــەڕی

بۆیـــــــه (پـــــــاکی ) ترســـــــــی زۆره تاســـــــــبەی
وا بمێنـــــــێ گیـــــــان نــــــــەدا گـــــــەر زاهـــــیری

پاکی
١٥/ ١٠/١٩٩٩

## چ فەرقێکی نەبوو بۆ من
## چوار خشتەکی شیعری پاکی

چ فەرقێکی نەبوو بۆمن
کەخۆر باران وەیا بایە
بەرێز هەرسێی لەعومری من
دەبەن گەرچی لەیەك جیایە

ژیانی من وەکو بەفری
سەری لوتکەی چیا وایە
دڵیش پارچێ لەگۆشتە نەك
وەکو شاخ و پۆڵا وایە

* * *

بەڵام ژیرمەند کەسێکە بۆت
لەخەندەت دوور کەوەستایە
دەزانێ چونکە هەر خەندەك
هەزار شینی بەکۆ تیایە

* * *

لە ئەو ساتی کە تۆم ناسی
لە داوی تۆ دەبا ڕاکەم
ڕەگی ڕیشەی ئەقین بڕم
کۆی خەرمانی خەم بەباکەم

* * *

نەدەم ئازاری دڵ چیتر
وەفا تەسلیم بای صەبا کەم
کەمێ بۆ خۆم بژیم و پشت
لە چەرخی چەوتی دونیا کەم

* * *

بەلاّم ژیرمەند کەسێکە بۆت
لەخەندەت دوور کەوەستایە
دەزانێ چونکە هەر خەندەك
هەزار شینی بە کۆ تیایە

* * *

ماوەیەکی زۆرە پرسێ
کەس نەبوو لەو شینە دام
هەر بۆ ساتێ شاد زەمانەش
وەك ڕەقیب ڕێی پێ نەدام

بۆیە هەندێ جار لەخۆما
بیر دەکەم خۆزگەم نەبام
یابەخەندەو پێکەنین و
شادو دڵ خۆش بام کەبام

بەڵام ژیرمەند کەسێکە بۆت
لە خەندەت دوور کە وەستایە
دەزانێ چونکە هەر خەندەك
هەزار شینی بە کۆ تیایە

* * *

بۆیە شەوقی لێ بڕابوو
تاسی شۆخم بووی لە سەر
چونکە عەکسی ڕووم بە ڕوویا
بوو بە ئاخ و پڕ کەسەر

خۆم کە دیل و بێ نەوا بووم
یاریش زوڵمی نا یەسەر
بیر بکا جارێ نەبوو قەت
گۆی شەقی بەر پێی بوو سەر

* * *

بەڵام ژیر مەند کەسێکە بۆت
لە خەندەت دوور کە وەستایە
دەزانێ چونکە هەر خەندەك
هەزار شینی بە کۆ تیایە

* * *

کەی دەدەی سەر تاوێ سەرما
تۆ بە کەیف و خەندەوە
کواچ ڕۆژێ دێی بە کوڵمی
ئاڵ و گۆنای قەندەوە

وەك لە لوتکەی چیا کە وەستاو
چاو بکەی بۆ کەندەوە
خۆشە پێ کەم نابی وەك شا
بێی بە قاپی بەندەوە

* * *

بەڵام ژێر مەند کەسێکە بۆت
لە خەندەت دوور کە وەستایە
دەزانێ چونکە هەر خەندەك
هەزار شینی بە کۆ تیایە

پاکی
٤/٤/٢٠٠٠

## ڕازانەوە

خەستە کەوتووم هاتووە یاریش لەو پەڕی ڕازانەوە
پێم دەفەرموێ چۆنی ؟ چۆن بم من بەکۆی زامانەوە

چی وەڵام دەم چاك دەزانیٚ دەردی دەردار نیمە بەس
ئۆقرەیە دڵ پێ نەما بۆ تیری ئەم نازانەوە

گێژ وەکو ڕێبواری شێوای وڕ لەژێر زریانی شەو
وا لە گۆشەی بێ هیوا مات چاوە پڕ گریانەوە

هەستێ ، سۆزێ ، دەنگێ ، چرپێ ، بێ لە ناڵەم کەس نییە
بێکەس و تەنها دەناڵم ڕوو ئازاری ژیانەوە

چی تروسکەی شاد بەحاڵم بێ لە بەختی ڕەش نییە
ماوم تەنها دەست بە ئەژنۆ ئاخ و ڕۆو فیغانەوە

باوەڕت بێ هەرچی خەونی خۆشی پێشیش بوو لە پێش
کۆی بەسەر لەم چەرخە ئەمڕۆ یەك بە سەد دامانەوە

وا لە دەست عومری لە ناکاو هاتوو چووی سەرسام و شێت
چاوە چاوی ( پاکی ) ما بۆ مەرگی بێ ئامانەوە

پاکی

٢٠٠١

## لێم گەڕێ
## چوار خشتەکی شیعری پاکی

لێـــم گـــەڕێ ، بـــا وەك وەلی و شـــەم شـــەم ببـــم هـــەردەم لـــەبۆت
ڕوو لـــە ڕووتـــا بـــۆت بســـوتێم کـــەم بـــە کـــەم دەم دەم لـــەبۆت
تـــێ بگـــەی تـــا بـــۆت خەلاتـــە گیـــانی مـــن ســـەرجەم لـــەبۆت
لێـــم گـــەڕێ ، ئاواتـــە مـــەرگی عەشـــق و ســـەد دەردم لـــە بـــۆت

* * *

لێـــم گـــەڕێ ، بـــا ڕاز و ویســـتی دڵ بـــەیان ڕۆن کـــەم لـــە بـــۆت
بـــەینێ باســـی کـــات بەســـەرچووی مەجلیســـی کـــۆن کـــەم لـــە بـــۆت
بـــەس زمـــانم لاڵـــە ئـــەمڕۆ شـــەرحی حـــاڵ چـــۆن کـــەم لـــەبۆت
لێم گـەڕێ ، چـــی چـــوو بەســـەرچوو ســـینە بـــا بـــۆن کـــەم لـــەبۆت

* * *

لێـــم گـــەڕێ ، خـــول دەم لـــەدەورت ببمـــە پەروانـــە لـــە بـــۆت
پـــڕ لـــە خوێـــن و ئێســـکە نـــازت ســـەد فیـــدات ئـــەم دوانـــە بـــۆت
دۆزەخیـــش خۆشـــە لەگـــەڵ تـــا خۆشـــە ئـــەم ســـووتانە بـــۆت
لێـــم گـــەڕێ ، سەربەخشـــی ڕێـــت و بـــێ فیـــدات ئـــەم جانـــە بـــۆت

* * *

لێم گەڕێ ، لافاوی نوح کەم ڕێك بەشین و زارێ بۆت
دەنگ بدا باسم لە کوچە و شار و گشت بازاڕێ بۆت
دەردی دونیا خڕ بچێژم تا نەبێ ئازارێ بۆت
لێم گەڕێ ، با ببمە کونجی ئاهو گشت زارێ لەبۆت

* * *

لێم گەڕێ ، با ڕووی بەهێم بێ سیس و زەرد ژاکاو لە بۆت
جێگە گۆشەی خەم مێوان بم وەك هەتیو داماو لەبۆت
دەردێ بگرم تێ نەگا کەس مەرگی من لەنکاو لە بۆت
لێم گەڕێ ، بتوێم لە ژێر پێت وەك دلۆپی ئاو لە بۆت

* * *

لێم گەڕێ، گەر لارو لەنجەت لێم گەڕێ خاڵیم لە بۆت
ڕۆژ و مانگ و ساڵم ڕێ کرد بەردەوام ناڵیم لە بۆت
بووم بە توتی و هەرچی فەرمووت کردم و حاڵیم لە بۆت
لێم گەڕێ ، چەند بەرزە فڕبم دێمەوە ماڵیم لە بۆت

پاکی
١٩٩٩/٧/٧

## هەر خودایی

شەرم ونازی هێندە ناوێ چاوەکەم بەو ڕادەوە
هەر خودایی کوشتەیی تۆم بێ شەڕاب و بادەوە

کردتە خوێناو جارێ جەرگم کافیە بۆت زولفەکان
بەس لە عەکسم بگرە بەردە بێنە بەسیان بادەوە

ئەسپی خۆی تاوداوە ڕوح کێش وا لە دەورم دێ و دەچێ
سا لە ڕێی ئەو کورتە ژینەی دوو نەفەس ما بادەوە

کوشتنی خەڵکان بە غەمزە ڕوحەکەم تاوانە بەس
من لە سەد لاوە کە دیلم بەو هەناسەی ساردەوە

هەر کەسێ میحڕا بی ئەبرۆت قیبلەکەی بێ سەیرە چۆن
پەست و شاد نابێ بەهۆشی ئەم خە یاڵ و یادە وە

شاری من بۆ خۆی شێوا بوو تۆش بەجەیشی ئەگریجەت
هەر وێرات کرد پات کە خستە سەر کۆلان وجادەوە

هێزی شك بەم کوا بەڕووی تۆ بێ دەبێ ڕوو زەرد هەڵێ
ئاخۆ من چبکەم بە هۆشی خاوو بیری سادەوە

بۆ حزورت جەژنە هاتم تا بەقوربانم بکەی
دیارە پێت کەم بوو نەهاتی بۆیە خۆت لێم شاردەوە

وات دەزانـــــی بـــــۆ هەناســـــەك مـــــن دەترســـــێم ڕادەکـــــەم
نـــــەت دەزانـــــی ســـــەر لەڕاکـــــەم بـــــۆت بەســـــوار و پیـــــادەوە

ڕوحەکـــــەم کـــــوردم هـــــەژارم چـــــم هەیـــــە گـــــەر گیـــــان نـــــەبێ
ســـــاکە وابـــــێ دڵ شـــــکاو پەســـــت بـــــۆ منـــــت وا نـــــاردەوە

(پـــــاکی ) بەدبـــــەختی و شـــــکاوی دڵ بـــــەتۆ تـــــازە نییـــــە
کۆنـــــە لـــــەو ســـــاتی نـــــەژادت بـــــوو لـــــەدەوری مـــــادەوە

پاکی
١٩٩٩/١٠/١٠

## نیگەرە

ئای کە گێژە سەر لەداوی ڕاوی تۆ
سیحرە هەستم وا کە غەمزەی چاوی تۆ

کەوتووە وەك خونچەی بەهارە نەونەمام
مەست لەبۆنی خاڵی کوڵمی گوڵاوی تۆ

دڵ شکاو ڕاوچی لە دوتا خۆی کەدی
دیل بە داوی زولفی پەخشی خاوی تۆ

کوا دڵی شك بەم نییە دڵ بێ ئەگەر
پڕ نەبێ زیکری ئەڤینی ناوی تۆ

شێخ نشینی زاهیدی ڕووی وەصفی تۆم
گەر دوریش بێ من وشەم کوا شیاوی تۆ

قەد لەژێر گردی خەمی تۆ دا چەمی
بوو بە نوشتەی لولی دەست پێچراوی تۆ

مەشخەڵی نەورۆز گڕی کڵپەی ئەگەر
بێ گوڕی وەك جۆشی دووری تاوی تۆ

ڕابوو (پاکی) بەس هەناسەی دێ بەهۆی
گفتە شیرنی شەکری لێو پاراوی تۆ

پاکی
١/٤/٢٠٠٢

## ڕاهاتووە

گەر شەڕیش کەی خۆشە هەرلێت هاتووە
کۆنە دڵ لەو بەزمە زوو ڕاهاتووە

ویست و ماڵ و گیانی خۆم بەخشی لەڕێت
چم نەما بڵێم داینێم بۆ داهاتووە

طفلی گڕنەی سینە بووم چۆن هات دڵت
چاو بە گریان منت لە گۆڕێ خستووە؟

داخی بەد بەختی پە شێوی حاڵی خۆم
داری هیوام هەر خەمی بەر گرتووە

چوم بەژێر لا فاوی قینی بێ بەزەیت
کەشتی دەر بازیش کەمابێ دەست تووە

(پاکی ) بێ هۆشە دەڵێ پێت چارەیێ
تۆی کە شیرین زۆر فەرهادت کوشتووە

پاکی
٨/٤/٢٠٠٢

# چل چرا

شـــین نـــەکا دڵ چاکـــــە چبکـــــا مەســـــتی دوور مەســـــتانەوە
چـــاری بـــێ بـــۆ خـــۆڵ دەکاتـــە ســــەر بـــە دوو دەســـــتانەوە

کـــۆی مووریـــدو تۆبـــەکاران ســـوژدە ڕووی بـــەن ئـــەی بـــــەمن
بۆچـــی فتـــوای شـــێت و تـــەوقی دەســـــت وپـــێ و بەســـــتانەوە

نـــارە واو تاوانـــە ڕووی ئـــەم پێـــم چـــراو شـــەم لالەکـــــەن
چـــل چـــرای شـــەو شـــەوقی کواشـــەو ڕابـــی کـــا هەســـــتانەوە

بـــەهار دوور بـــوو گـــوڵ و عـــەتریش نـــەباری بـــوو ئـــەدی چـــۆن
هـــانی ئـــەو بـــــۆن و بەرامـــــە لــــەکوێ بەوزســـــتانەوە

خوایـــە چـــی بـــەو شـــۆخە مـــن دیـــم ئێـــوە نـــەیبینن نـــەوەك
دینـــە چەشـــنم بـــن بەعەشـــقی پـــاکی کوردســـــتانەوە

ســـەیرە شـــێوەی تـــاوێ گەرکـــەی وەك نـــەیاریش هیـــچ نەکـــەی
بـــۆ قوربـــانی دوای لەڕاکـــەی لـــێرە تـــا کوێســـــتانەوە

هـــەر بـــەچاوان بێـــژێ چـــاوان ژێـــرە کـــەعبم کـــە بڵێـــم
بـــێ خـــەڵات تـــۆی پـــێ نـــەبینم چاکـــە بـــۆ پەســـتانەوە

شـــادی دەوری (پـــاکی ) گرتـــووە ئـــەو دەمـــە ســـۆیند بـــەو دەمـــە
چونکـــە گـــڕ لـــەگیانی ئێشـــی کـــوا بـــەتۆو کەســـتانەوە

پاکی
٣/ ٣/ ٢٠٠٢

# گۆشە گیری

ئـــەو دەمـــەی فـــەرمووت کـــەچۆنی هـــات شـــیفای دەردم بـــەکۆ
جابـــە قوربـــان چـــۆن نـــەبم بـــۆ خـــاکیْ تـــۆ لیْی بـــووی کـــە کـــۆ

دەك زمـــانم لالْ بـــیْ یـــاخوا گـــەر لەمـــەو دوا مـــن بلێم
شـــادو دلْ خـــۆش نیـــم دەچێـــژم دەردو ژان و ئێـــش و ســـۆ

نـــەچوە گوێـــم هـــاوارو ترســـی قـــەت تـــەبیبان تـــەرکی مـــەی
زیـــانی لـــەکویْ کـــوا شـــەڕابیْ نـــۆش بـــە ڕووی مـــانگی ئـــەتۆ

گـــەر بەخـــەندە و شـــیرنە گفـــت و نەرمـــە قاقـــات نێمـــە حـــەی
نابمـــە گۆشـــە گـــیری تەکیـــەش چـــۆن دەبم پـــیْی دەســـخەڕۆ

بیْخـــەلاْتت خوێنـــی گیـــانم قەســـەم نـــەم بەخشـــی ئەگـــەر
بـــۆ ڕزگـــاری دیـــل لەبـــەندو بـــۆ ولاْتـــیْ ســـەر بـــەخۆ

دیـــم لەزســـتانا بـــەهار هـــات کـــاتیْ لێـــوت هـــات بـــزەی
ڕاســـتە کـــەی ئـــەی بـــۆ دەلێـــن دار پـــیر بـــوو دەر ناکـــا چـــڕۆ

کـــوا پزیشـــکان چـــاری دەردو زامـــی زامـــداران دەکـــەن
ڕاکـــە شـــیفای دەرد گـــەرە کتـــە هـــا بـــە بـــۆی ســـینە و بـــەرۆ

گیـــانی (پـــاکی ) کـــە بەفەرشـــی ڕێگەکـــەت بـــەو مەرجـــەوە
ڕامـــەبورە تیـــژ بـــە ســـەریا ســـوك بـــە لەنجـــەو نـــاز بـــڕۆ

پاکی
١٩٩٨/٨/٧

## چۆن بژیم بەبێ دڵ ئەمن
## شەش خشتەکی شیعری پاکی

پەنجــە ئــاڵ کــە بـــەس بـــەخوێنم زولفـــی بـــەس پـــێ هـــەردەوە
بـــەس دڵـــە خورپـــەم پـــێ بگـــرە و دڵمـــی بـــەس پـــێ بـــەردەوە
مـــاری بـــێ ئامـــانی زەردیـــش دوو بەشـــان بـــەس بـــەردەوە
کـــــوردو ناترســـــێم و فـــــێرم ڕاو بـــــەکێوو و هـــــەر دەوە
هەســـتە ڕەحمـــێ کـــە بـــەحاڵم تـــازە ســـاڵە و ســـەردەوە
چـــۆن بژیـــم لێرانـــە تـــەنیا مـــن بـــە کۆڵـــێ دەردەوە

* * *

مـــــەبڕە دڵ چیـــــتر بـــــەنازو پێکـــــەنین و گفتوگـــــۆ
هـــەی پـــەری بـــالا نـــەمامی جوانـــی بـــەرزی شـــاری کـــۆ
گیـــان دەبەخشـــێ بـــۆت کەهـــەرچی تـــۆ دەبینـــێ ســـەربەخۆ
تـــاجی پاشـــایم کـــەناوێ پێـــم کـــەرەم کـــەی سەرســـەکۆ
هەســـتە ڕەحمـــێ کـــە بـــەحاڵم تـــازە ســـاڵەو ســـەردەوە
چـــۆن بژیـــم لێرانـــە تـــەنیا مـــن بـــە کۆڵـــێ دەردەوە

* * *

بـــەندو تەوقـــە مـــل بـــە داوی پەرچـــەمی چـــین چینـــی تـــۆ
کـــویێ بـــڕۆم ســـەختە لـــە یـــادم چـــیێ پـــەری ڕووی شـــیرنی تـــۆ
گیـــانی خـــۆم بـــۆ تـــۆ چـــرا کـــرد ڕوون ببـــیێ تـــاژینی تـــۆ
دیـــارە بـــیێ بەختیمـــە بـــۆ یـــە حـــاڵی مـــن نـــابینی تـــۆ
هەســـتە ڕەحمـــیێ کـــە بـــەحاڵم تـــازە ســـاڵەو ســـەردەوە
چـــۆن بژیـــم لێرانـــە تـــەنیا مـــن بـــەکۆڵی دەردەوە

* * *

خـــۆ کـــە تـــۆم ناســـی لەپێشـــا چـــاوت ســـیحری تیـــا نـــەبوو
ئـــەم هـــەموو هێرشـــەی کـــە کـــردت بـــۆ ســـەرم قـــەت شـــیا نـــەبوو
ســـا لەگـــەڵ ئـــەم دەردو ژانـــەش قـــەت دڵـــم لێـــت جیـــا نـــەبوو
دڵ ڕەقیـــش وا بـــۆ عـــەزیزم خـــۆ دڵـــی تـــۆ چیـــا نـــەبوو
هەســـتە ڕەحمـــیێ کـــە بـــەحاڵم تـــازە ســـاڵە و ســـەردەوە
چـــۆن بژیـــم لێرانـــە تەنـــها مـــن بـــەکۆڵی دەردەوە

* * *

بەرگـــە نـــاگرم چـــۆن کـــە بگـــرم تـــۆ بـــە کەیفـــە چیـــات لـــە قـــاند
چـــەنگت وەك بـــاز تیـــژ لـــە دڵمـــا کـــردو بـــردو تێـــت تـــەقاند
خۆشـــی دەریـــای شـــادی ژینمـــت هـــەر لەســـەر تـــاخوار شـــەقاند
چـــەند خـــەمی دونیـــا بـــوو هێنـــات وەك عەلـــەم بۆمنـــت چـــەقاند
هەســـتە ڕەحمـــی کـــە بـــە حـــاڵم تـــازە ســـاڵە و ســـەردەوە
چـــۆن بژیـــم لێرانـــە تەنـــها مـــن بـــەکۆڵی دەردەوە

چــۆن دڵــت هــات تــۆ دڵــم بــــەی چـــۆن بژیــــم بــــێ دڵ ئـــەمن
ســـینەکەت وەك شـــێخ و چـــاك بـــوو بـــۆ چـــی تـــۆ داتخســـت لـــەمن
ســـەیرە لـــەو پـــەندەت تـــێ ناگـــەم تـــۆ لـــەپای چـــی کـــرد بـــەمن؟
یازەمـــان حوکمـــی وەهـــابوو ســـوچ نـــەهی تـــۆ بـــوو نـــەمن
هەســـتە ڕەحمـــێ کـــە بـــەحاڵم تـــازە ســـاڵە و ســـەردەوە
چـــۆن بژیـــم لێرانـــە تەنـــها مـــن بـــە کۆڵـــی دەردەوە

پاکی
١٩٩٩/١٠/١٠

# خونچە

دڵ هەتاکو شێتی داوی زولفی ئەو دوو تایە بێ
هەردەبێ مل تەوقی ترس و لەرزی نار ئەو تایە بێ

ماری سەر پشکۆی بەگڕ کوا چەشنی من جەنگڵ دەدا
بێ سوتا وەك من سوتا کوا عەشقی ئەو سەودایەبێ

پێی بلێن بەو شۆخە ڕازاو خۆی نەکا توخوا بەسە
ئەو کەشازادەی هەموو کۆی جوانی ئەو دونیایە بێ

نامەوێ قەت چی بەها بێ و زیندەگی عیسای ئەبەد
زێرە زولفی زەرد هەتاوی تالە سەرما سایە بێ

خونچە نادەم قەت بەخونچە یابەهارێ خونچەکەم
بێتو گوڵزاری هەمیشەی نەخشی دەست ئەم خوایە بێ

پێم دەڵێن هاوارو دادی چیتە هاوار چۆن نەکەم؟
عەشقە شێتی من کەساوای ڕووتی ژێر سەر مایە بێ

چەند سەرم دێنم و دەبەم بۆ چاری دەرد شك بەم نی یە
دیارە بەو داخە دەڕۆم تا لەوکونە ئەو بایە بێ

شــەرتە ســــەرپێ وەك وەنەوشـــە بــۆت بــەرم كورنــوش بەســەر
پاســـەوانێ تـــا بـــە وەفـــای (پـــاكی ) ئـــەو دەرگـــا یــــە بــــێ

پاكی
٢٠٠١/٨/١

ئەم شیعرە لە ژمارە ٣ی ساڵی ٢٠٠٢ی گۆڤاری ئەمڕۆ بڵاوكراوەتەوە.
هەروەها لەژمارە ٦٨ی ساڵی ٢٠٠٢ی گۆڤاری بێوار بڵاوكراوەتەوە.

# ئەڤین

دڵ لە شێواوی بێ ئەندازەیە
کوشتەی ناڵەی دەست ئەو ئاوازەیە

پێچراوی خەمە بەندە دیلە وەك
ساوای ناو لانکی ژێر دەسرازەیە

نە پێکەنین هەی نە خەندێ لە ڕوو
نە تۆزێ شادی نە ساتێ بزەیە

چی سەر هەڵدەدا و لە دایك دەبێ
هەر ئاخ و زام و هەر ساردی کزەیە

شیرینی شك نابەم شك بەم بە چاوت
فرمێسکی بە گوڕی چاومە مەزەیە

جەستەم وشك و ڕەق بۆتە هەنارە
ڕزیوی پاش ماوەی دوای ئەو ڕەزەیە

دوای بەکۆ زامیش هێشتا بۆ ئەڤین
دڵ سەرمۆری ئەم ڕاز و نیازەیە

خـــــــادیی قـــــــاپی و دەروێشـــــــــی ڕووتـــــــــە
وەك ســــــــاوای بـــــــەگوڕ و گـــــــاڵی تازەیـــــــە

بـــــە یادتــــــە (پـــــاکی) کێـــــوی خـــــەم دەبـــــڕێ
چ بـــــــاکی ســــــــەختی و بـــــــەو هەورازەیــــــــە؟

پاکی
ئادار ١٩٩٩

## بێ سەدای من

بــــێ ســــەدای مــــن کــــوا ســــەدای گریانــــە خــــۆ
هــــەر دڵــــەی مــــن شــــەق شــــەق و بریانــــە خــــۆ

بۆیــــە هــــاوار و ســــکاڵام دێ و دەڵێــــم
ڕۆژی وەشــــیوم غوربــــەتی و دابڕانــــەخۆ

کــــێ وەکــــو مــــن شــــادی وەك ڤینــــۆس پــــژا
بــــوو بــــە تــــەرزەی بــــەخوری ژێــــر بارانــــەخۆ

کــــوا بــــەڕووی ئــــازیزە تــــێر بــــووم پــــیری هــــات
بۆیــــە مــــات و دڵ شــــێواو وێرانــــە خــــۆ

خۆزگــــە بــــەو کــــات و دەمانــــەی ئــــەو دەمــــە
بــــوو لەســــەر دەم دوور بــــوو لــــەو ســــوتانەخۆ

ئــــای کــــە خــــۆش بــــوو کــــاتێ زوو ڕوو باوەشــــی
گــــەرمی یــــەك بوویــــن وەك خەلــــەو خەرمانــــە خــــۆ

هــــەوری ئــــاهی دووریمــــە لــــەو هاوینــــە
هــــا نیــــە بــــاران کــــوا دەنــــا زســــتانە خــــۆ

(پــــاکی) فریــــات ناکــــەوێ کــــەس کــــۆی بــــەڕووت
تــــۆ دەڵــــێی چــــی جــــەنگ و تــــیر بارانــــە خــــۆ

پاکی

## بەو غەمزەیە

کـــــاتێ چـــــاوی کــــــردەوە بــــــەو غەمزەیــــــە
چــــۆن نــــەمردم ســــەیرە ئــــای لــــەو لەحزەیــــە

بــــاوەڕت بــــێ جــــەنگێ وای قــــەوماند گوڵــــم
تــــاکو ئێســــتاش مــــاوە هــــەروا فیتنەیــــە

گــــەرچی ســــەر قافڵــــەی عەشــــق بــــوو مــــەم بـــا
نــــەیدەگرت خــــۆی ڕای دەکــــرد لــــەو مەرزەیــــە

دیــــل بــــەداوی بــــوو دڵــــی مــــن بۆیــــە وا
بــــزرو وون مــــا کــــێ دەڵــــێ لــــەو ئەرزەیــــە

زۆر بــــێزارو پەســــتە ئــــەمما هیمــــەتی
ســــەنگی زۆرە دوو بــــە ئــــەو چیــــا بەرزەیــــە

ســــەختە (پــــاکی) بــــێ دەربــــاز لــــەو حاڵــــەدا
چونکــــە عاشــــق هــــەر ســــووتای ئــــەو بەزمەیــــە

پاکی
١٩٨٨

# بەکۆڵی زام و ئاخەوە

داوت تەوقی ئەستۆ نەبێ
بۆنی زولفت شەوبۆ نەبێ
شیرن و جوانیت لێ کۆ نەبێ
بەکۆڵێ زام و ئاخەوە
عاشق چیدا بەشاخەوە
سوتاو شەیدا بە تۆ نەبێ

* * *

ڕەوتت مۆسیقای ژیان نەبێ
خەندەو بزەت هەتوان نەبێ
دونیا بە تۆوە جوان نەبێ
بەکۆڵێ زام و ئاخەوە
عاشق چیدا بە شاخەوە
دەمت دەمی چرۆ نەبێ

* * *

هاواری زامی تۆم نەبێ
بێزاری ژیانی بووم نەبێ
گریانی بەختی شووم نەبێ
بەکۆڵێ زام و ئاخەوە
عاشق چیدا بە شاخەوە
سەر بەردەباز و گۆ نەبێ

* * *

سینەم بۆ قەدەمت نەبێ
قەبری ڕازو غەمت نەبێ
کوشتەی زراوی قەدت نەبێ
عاشق چیدا بە شاخەوە
بەکۆڵێ زام و ئاخەوە
گەرداوی دەستخەڕۆ نەبێ

* * *

ڕووی سیحراویت مینبەر نەبێ
چرای شەوی دولبەر نەبێ
مەرقەدی سەودا سەر نەبێ
عاشق چیدا بە شاخەوە
بەکۆڵێ زام و ئاخەوە
نیگات بۆ دڵ چەقۆ نەبێ

## هەموو هاواری

## پێنج خشتەکی شیعری پاکی

دەروێش لەو لا بە حەی دێ
ساقی بەو لا دەست بەمەی دێ
عاشق ئاهوشین و وەی دێ
هەموو هاواری یار کەی دێ
ناڵەی دڵی وەکو نەی دێ

* * *

ژوانی دەم تریفەی مانگە شەو
شاخ و بەفر بناری پڕکەو
خۆر لە دەریای پڕ وردە چەو
هەموو هاواری یار کەی دێ
ناڵەی دڵی وەکو نەی دێ

* * *

یارو وەفاو نیگاو غەمزە
گۆناو لەنجەو خەندەو بزە
عەشق و جوانی ساقی و مەزە
هەموو هاواری یار کەی دێ
ناڵەی دڵی وەکو نەی دێ

پەزو مێگەل ، بلوێر شوانی
روبار شەپۆل، کاریز کانی
پەری و عاشق، بەهار جوانی
هەمووی هاواری یارکەی دێ
سۆزی ناڵەی وەکو نەی دێ

* * *

بەهەشت ڕازاو دوڕ کوردستان
بەهاری دوای شەختەی زستان
کۆچ و مەلی قوڵینگی کوێستان
هەموو هاواری یارکەی دێ
سۆزی ناڵەی وەکو نەی دێ

* * *

بەیان شەونم ، گیا گوڵ گەڵا
مەردو چەلەنگ سەنگەر قەڵا
تەوقو ئەستۆ ، کورد و بەڵا
هەموو هاواری یارکەی دێ
سۆزی ناڵەی وەکو نەی دێ

پاکی
ساڵی ٢٠٠٠

## زووکـــــه

دەهەســـــتە زووکـــــە ڕاکـــــە ســـــاتێ خۆشــــــی پەیاکـــــە
ئـــــەم هاتووئـــــەو چـــــوو بەســـــە تـــــاوێ خـــــۆت دڵنیاکـــــە

بـــــڕۆ ئـــــەم دەشـــــت و شـــــاخە بـــــۆ ئـــــەم چیمـــــەن و باغـــــە
جـــــەفاو کەســـــەر هەتاکـــــەی دەرکـــــە لـــــە دڵ چـــــی ئاخـــــە

بـــــۆ ئـــــازیز گـــــوڵ بـــــەهاوێ چـــــاو لەســـــەر چـــــاویش تـــــاوێ
تەمـــــەن کاتێکـــــە و دەڕوا قـــــین و یـــــاخی، پـــــێ نـــــاوێ

هـــــەر بـــــەیادی ڕابـــــوردوو بـــــەوکاتی دەســـــت لـــــەمل بـــــوو
گیـــــان و خوێـــــن و هەناســـــە هەرســـــێ کـــــە تێکـــــەڵ بـــــوو بـــــوو

ئۆمـــــەر خوچـــــان قەشـــــەنگە چ کـــــاتی شـــــەڕو جەنگـــــە
گولاڵـــــەش لـــــەڕووی گۆنـــــات ســـــیس و ژاکـــــاو بـــــێ ڕەنگـــــە

گـــــەردوون هـــــەر دەم لـــــە ڕاوە زۆری وەك تـــــۆی قـــــوت داوە
تـــــۆش نوقمـــــی یـــــەك هەناســـــەی ئەگـــــەر بـــــۆت نەگـــــەڕاوە

ئینجـــــا پشـــــووی ژێـــــر دارێ هەریـــــەك بـــــۆ خـــــۆی بـــــەبارێ
بۆنـــــی تکـــــەش دێ لەگـــــەڵ خـــــۆش یـــــاپراغی بـــــەهارێ

پاشـــــان لـــــەدوای دەســـــت بـــــەردان بـــــەدەم نوکتـــــەی ســـــەربەردان
لەگـــــەڵ خـــــەندەو چـــــای خۆشـــــی پـــــڕ لـــــە گوڵـــــی ســـــەر ئـــــاگردان

ئەمـــــەش لــــە پێــــش کۆتــــایی دوو پێچــــە نەرمــــە شــــایی
جـــــەژنی دڵــــداره هــــــەینیٚ خۆشەویســــــتی خودایــــــی

ئێســـــتاش دەمـــــەو خــــــۆر ئـــــاوا زەردە وەك مـــــاو نـــــەماوە
توخــــــوا چـــــاویٚ بخشـــــێنە بـــــــەم بەهەشـــــــتە ڕازاوە

بڵــــیٚ ئـــــاوابیٚ وڵات ســـــەرم بـــــۆی بەخشـــــەو خــــــەڵات
کاولگـــــە بــــیٚ شـــــارەکەم لــــەلام هــــەر کۆشــــکەو قـــــەڵات

پاکی
٥/ ٥ / ١٩٩٥

ئۆمە رخوچان: شوێنی سەیرانگای شاری کۆیە بوو لەکۆن.

# هەتا ماوم

هـــــەتا مـــــاوم لــــەدونیادا دەبـــــێ هـــــــەردەم شـــــێواوی بم
وەکـــو فـــەرهاد لەدەشـــت و کێـــو لـــە چـــۆل و هـــەردو ڕاوی بم

کـــەمن عاشـــق بـــەگولزار بم لـــەدرکی چـــۆن دەبـــێ ســـڵ کـــەم
دەســـا بـــەخوا هـــەتا مـــردن دەبـــێ کوشـــتەی دوچـــاوی بم

فریـــوی دام بـــەبێ بـــاکی دڵـــی بـــردم بەیـــەکجاری
ئـــەبێ حـــاڵم چ بـــێ دوایـــی کەبـــەندەی تـــیرو داوی بم

دەس بەئـــەژنۆ منـــم هـــەردەم لەگۆشـــەی خـــەم بـــەناچاری
بەشـــەو تـــا ڕۆژ بـــەڕۆژ تـــا شـــەو لـــەیادی زولفـــی خـــاوی بم

ســـەرو مـــاڵم لـــەبۆ چـــی بـــێ ئەگـــەر دووربم لـــەچاوی یـــار
بەهەشـــتە لام کـــەیار لام بـــێ گـــڕی دۆزەخ لـــەناوی بم

لـــەتیرو تانـــەیی خـــەڵکی نییـــە بـــاکم لـــە ئـــەم چەرخـــە
دەڵێـــن چـــی بـــاڵێن خـــەڵکی کـــە قـــەڵغانی پێنـــاوی بم

بـــەهاری مـــن گوڵێکـــە و بـــەس هـــەتا دەمـــرێ لـــە ژیـــن (پـــاکی)
کەواتـــە گیـــان بـــەقوربانی چیـــە توخـــوا کـــەلاوی بم

پاکی
بەهاری١٩٨٧

# ئەی مانگ

ئەی مانگ تۆ لەسەر منیش لەخوارێ
هەردوو دڵ شکاو هەریەك بەبارێ

تۆ لەژێر هەوری ڕەشدا دەناڵی
منیش بۆ خاکی پیرۆزی ناڵی

تۆ داخی سوێندی پێت دەخۆن بەدرۆ
منی بێکەسیش لەدونیای ئەمڕۆ

تۆ داخی جەرگی بەناهەق برژاو
منیش وەك ئاردی نێو درکی پڕژاو

تۆ مردەی نەبووی مافێکی ڕەوان
من تێنوی ڕاستی و وەفای پێشڕەوان

تۆ زەردو خەستەی حوکمی کوێرانە
من جوانە مەرگی وەتەن وێرانە

نەتۆ دەردەچی لەم چەرخە کۆنە
نەمن دەزانم ئەنجامم چۆنە

نەتۆ دەگەی پێم نەمن دەگەم پێت
بۆیە ناوبراوین هەردووکمان بە شێت

بــــــــەڵام گــــــــوێ بگــــــــرە لەبــــــــەندەی لاواز
دانــــــــێ بــــــــۆ ناڵــــــــەم شــــــــیعرێ بــــــــە ئــــــــاواز

بــــــــەس وریابــــــــە بــــــــۆم زۆر بــــــــەکوڵ نــــــــەگری
لافــــــــاو کــــــــەی عالــــــــەم وەپێــــــــش خــــــــۆت بگــــــــری

هــــــــەم وردیــــــــش بــــــــە زۆر نــــــــەوەك گــــــــڕ بگــــــــری
ئاسمــــــــان بســــــــوتێ و دونیــــــــا مــــــــان بگــــــــری

پاکی
٢٠/٥/٢٠٠٠

# وەسـفت

وەسـفت حـەز دەکـەم بنووسـم کـەمێ
حـەیران و سەرشـێت خـۆم لـە دونیایـە

هـەرچی دەربـڕم شـایەن بـێ بـەتۆ
زمـان لاڵ دەبـێ وشـەم بـۆ نایـە

دەم تێـك دەئـاڵێ و خـەرمانی وشـەم
دەڵـێی ژێـر شـەنەی بـەر ڕەشـەبایە

دڵ خورپـەی دەکـا و زیـڕەی دێ وەکـو
سـاوای بـەر مـەمی شـیر لێ بڕایـە

پێنـووس دەشـێوێ و دەسـتم دەلـەرزێ
وەك تـەوقی دوژمـن لـە ملـم بـێ وایـە

چـاو خاکـە وشـکە بـۆ پـەرەی ڕووتـا
بـۆت پـەری ئاسـا دەسـت بەدوعایـە

سـووتانێ وەهـا گیـان بـۆت سـووتاوە
خۆڵـە مێشـی دوای پشـکۆ وەهایـە

دونیـا مەسـتە پێـت هەرکـەس دەتبینـێ
کـۆی شـەراب دەڵـێی لەکەللـەی دایـە

وێنـــــەکێش کـــــوا هـــــەی بکێشــــــێ وێنـــــەت
(مــــانی)[٤] ش دیـــــن دەبـــــوو ئەگـــــەر بمایـــــە

هێنـــــد بـــــۆت خومـــــارم خــــەیبام لـــــە چاومـــــا
نــــەیدیوە مەســــتی مـــــەی پــــێ نەدرایـــــە

بڵێـــــم تـــــۆی بـــــەهار دونیـــــات قەشــــەنگ کــــرد
بـــــەهار دەمێکــــــەو نـــــامێنێ دوایـــــە

بڵـــــم ڕووت مانگـــــە مـــــانگ شــــەو بەنرخـــــە
بـــــەڕۆژ کـــــوا نرخـــــی بـــــێ ڕێـــــزو پایـــــە

بڵێـــــم ڕووت ڕۆژە ڕۆژ هـــــەر بـــــەڕۆژە
شـــــەو وێڵـــــە وەك مـــــن خـــــۆی حەشـــــاردایە

بڵێـــــم ئـــــەڵماس و گەوهـــــەر یـــــا دوڕی
کارگـــــەی زێـــــر هـــــەبێ لـــــە ڕووت خولقایـــــە

بڵێـــــم کـــــەمان و ســـــازو بـــــاندو نـــــەی
ســـــۆزی وان لـــــەچاو قاقـــــات هـــــەر نایـــــە

بڵێـــــم نـــــێرگزی یـــــاکنێر بـــــەیبون
کـــــۆی بۆنـــــی خۆشـــــی لـــــە ڕووت پڕژایـــــە

(٤) مانی وێنەکێشێکی کورد بووە داوای خوایەتی کردووە پاشان کوشتویانەوە پێستەکەیان کا تێکردووە لەسەر شەقام هەڵیان واسیوە.

بڵێـــــــم ڕووبـــــــــاغی بەهەشـــــــــتی بەهەشـــــــت
کـــــــــەس ڕووی نـــــــــەدیوەو ڕووت ئاشـــــــــکرایە

پەلکــــــــە زێرینـــــــەش تیشـــــــکی ڕووت نـــــــەبێ
ئـــــــەم شـــــــێوە خواییـــــــەی لـــــــەکوێ هێنایـــــــە

بڵێـــــــم وەك (عیســـــــا) دڵ نـــــــەرمی (عیســـــــا)ش
هـــــــەر بۆکۆمـــــــەڵی هـــــــاتبووە کایـــــــە

کـــــــوا بـــــــەمن (یـــــــەعقوب) فرمێســـــــکی بـــــــۆت ڕشـــــــت
ئـــــــەو لـــــــە چـــــــاو مـــــــن کـــــــوا؟ هـــــــەر نەگریایـــــــە

(زولێخـــــــا) بـــــــە یوســـــــف نـــــــەیاـی ئـــــــەم دەردە
ئـــــــەو شـــــــاد بـــــــوو دوا پـــــــێی ئـــــــی مـــــــن هەرمایـــــــە

هـــــــەمووی نۆکـــــــەرو پاســـــــی دەرگاتـــــــە
کـــــــۆی بـــــــەڕێز ئەگـــــــەر وەزیـــــــرو شـــــــایە

پـــــــەری و فریشـــــــتەو حـــــــۆری و پـــــــەریزاد
هـــــــەموو لـــــــە ئاســـــــتتا وڕو دامایـــــــە

بـــــــۆ هـــــــەموو کـــــــارو هەســـــــتێ بەهەســـــــتی
شـــــــەرم لـــــــەڕووتا دەڵـــــــێی دەریایـــــــە

بـــــــۆ تەمـــــــەن بچـــــــوك، لـــــــەژێر هەیاســـــــی
وەڵامـــــــی شـــــــیرنت هـــــــەر بـــــــەڵێ و ئایـــــــە

ڕازاوە و جوانـــــــی هـــــــەروەك كراســـــــیٚ
لەســــەر هـــــەتا خـــوار بـــــە تــــۆ بڕایــــــە

وەفـــــاو دڵ نـــــــەرمی وپـــــــاکی دەروونـــــــت
ڕەگـــــــی لەڕیشـــــــەی دڵتـــــــا چەقایـــــــە

هێشـــــــتا بـــــــەدوری لـــــــەکاری گێتـــــــی
دڵـــــت بـــــیٚ خۆزگـــــەو هیـــــواو بڕیایـــــە

ناســـــکتر لـــــەگوڵ ڕوومـــــەت پـــــەڕەی گـــــوڵ
ئەمـــــەش خـــــەڵات و دیـــــاری خودایـــــە

چـــــواردەی مـــــانگ نـــــەبیٚ هـــــات ئـــــەمیش هـــــەڵات
کـــــە بینـــــی (ئـــــاهی) و چـــــرۆ وەســـــتایە

پاکی
١٩٩٦/٦/٧

**پێشکێشکردن**

ئـــــەم پارچـــــە هۆنراوەیـــــە پێشکەشـــــە بـــــە هـــــەردوو کچـــــە خۆشەویســـــتەکانم (ئاهی و چرۆخان) بۆ یادگاری هەروەها پێشکەشە بە هەموو منداڵە ئەنفالکراوەکان

## غەمزەی چاو
## پێنج خشتەکی شیعری پاکی

کوانــــێ حوکمـــی تـــیرو خەنجـــەرکار لەســـینەم کـــەی دەکـــا
وەك بەغـــەمزەی چـــاوی والآی دوگمەکـــەی ســـوخمەی دەکـــا
یـــا نیگـــای بـــەدزی لـــە لایـــێ ویێـــم کەجـــەنگی بـــەی دەکـــا
یـــا بـــەناز جارجـــار کـــەزولفی دەگـــری گوایـــە شـــەی دەکـــا
جـــاچلون نـــەمرم لەخۆشـــیان یارکەئـــەو بەزمـــەی دەکـــا

* * *

لـــەچاو عەشـــقم کـــوا مـــەم و زیـــن وەك نـــەبێ ئەفســـانەیە
دور لـــەڕووی وەك هـــەردو چـــاوم بـــێ لەســـەر یـــا تانەیـــە
هـــەندێ شـــەو مەســـتم خـــەیاڵی خوایـــە قـــەت ڕۆژ دانەیـــە
مـــن بـــەدڵ شـــابم چ بـــاکم تـــاجی بـــووی شـــاهانەیە
ئەودەمـــەی قوربـــانی تـــۆزی پایـــە دڵ تۆخـــەی دەکـــا

* * *

هـــەندی جـــار خـــۆڕا لـــەخۆیا پەســـتە دڵ دێوانەیـــە
ســـەردەمێ بـــێ هـــۆش و مەســـتی ســـیحری ئـــەو چـــاو جوانەیـــە
کـــاتێ دەیبینـــم لـــەدەوری رووچـــرای پەروانەیـــە
وەختـــێ شـــادە دەســـت لەســـەرمل کوشـــتەخاڵی دانەیـــە
کێـــو ســـەما دێنـــێ لـــەکاتێ یـــار کەئـــەو بەزمـــەی دەکـــا

بێنــــە کـــا شـــادی بـــەگوڕ بـــۆ وشـــکی دڵ بـــارانی بــــە
بۆغولامـــــی قامـــــەتی رووی دێـــــوەرەی شـــــارانی بــــە
بــــۆ لــــەرەی دووســـێوی ســـینەی دەم ســـەماو گۆرانـــی بـــە
ســـاردە بیـــانی دووربـــە توخـــوا شـــیرنە رووی ســـۆرانی بـــە
شـــلکەلەنجەی وەك دەبـــا هـــۆش کـــەی شـــەڕاب پێـــم وەی دەکـــا

* * *

هـــەندێ جـــار ســـاوایە دەگـــری شـــینی مـــەیلی تۆیـــەتی
کـــاتێ شـــەڕخوازە بـــەزولف و ترســـی شـــیری برۆیـــەتی
ســـاتێ بـــۆ ژوان هـــا لەســـەرێ خوێـــن لـــە کاســـەی گرۆیـــەتی
هـــەردەمیش بـــۆ باوەشـــی خـــەم شـــادە دۆســـتی خۆیـــەتی
شـــاهێدی رووم دووریـــە رەنگـــی زەعفـــەران وبـــەی دەکـــا

* * *

خواســـتی دڵ چەوتـــە بـــە زۆری پیـــاو لـــەرووی شـــەرمەندەیە
پـــڕ بـــە ڕۆژگـــار زۆرە رازی خۆشـــی پـــێ هۆشمەندەیـــە
هـــەندێجار خـــۆی شـــا دەبێنـــی وشـــاش غـــولام و بەندەیـــە
کـــاتێ شـــێواو دەگـــری کـــاتێ دەم بـــەقاقاو خەندەیـــە
زوڵـــی بـــێ کۆتـــای گوڵـــم لـــەو بەختـــەپڕ شـــومەی دەکـــا

* * *

خاڵەکـــەی مەحبوبـــە ســـەردڵ مـــابێ چـــارەو(شـــافی)یـــە
کـــوا رزگـــاری کێـــوی خـــەم بـــێ تالەشـــانی (پـــاکی )یـــە
ناهـــەقی کـــرد تـــیری ئـــەبرۆی کوشـــتە غـــەمزەی (کـــافی) یـــە
وەســـفی بـــاری بـــێ وەفـــای یـــار کـــوا لـــەلام لای (صـــافی)یـــە
بـــەگوڕی ســـەیلی ئەشـــکی چـــاوم هـــاژەی لـــەو چۆمـــەی دەکـــا

پاکی
نەورۆزی ۲۰۰۳

## کوا وەفایی

لەرِێی عەشقا عەزیزم کوا وەفایی؟
سەرو ماڵ وتەمەن چوو دام لەسایی

تو ئەسحابەی سپی چتدی لە غەیری
جەفاو جەورو پەشێوو دڵ سوتایی؟

ئەوەی سەرچۆپی عەشقی گرت بەخوێنی
چ بوو ئاکامی وای فەرموو وەفایی ؟

لەگۆشەی ژیانی زیندانا وەکو شەم
بەبێ ئاگا دەسوتێ تا کۆتایی

بەهاری ژیان مەدۆرێنە بەپایز
(نەدەم)(*) دێنی بەخار خونچە لەبایی

مەبە سەر پشکی ئازارو پەپولەی
قەشەنگی دڵ بەسەرگوڵ جوانە خوایی

گەلێ سەختە سەحەر تادێ لەئامیز
(شەوی یەڵدای)(**) باوەشی زامی جیایی

---

(*) ووشەیەکی عەرەبیە واتە (پەشیمانی)

**) شەوی یەلدا درێژ ترین شەوی زستانە

لـــــەناوکورەی جـــــەفای عەشــــــقا کـــــــەدوری

چ حــــــاڵی هــــــەی لەئێشـــــی زامـــــی دوایـــــی؟

مەکـــــە کاســــــەی گـــــرەو خوێنـــــت چ باکـــــە

دەڵـــــێ سەرشـــــێتە خوێنـــــی ڕێشـــــت خوڕایـــــی

پاکی

٨ / ١١ / ٢٠٠١

# گوڵ بارانە

گوڵ بارانە تۆ تۆرانت لای منە
گەر تۆرانت جار بەجار گیان بردنە

دوورە خەندەی لێوی شیرینت، گەرگوڵیش
بێ بەڕووما پێبکەنێ لام دوژمنە

بێ لە غەمزەو دوبزەو یەك دونیگا
شاد بکا دڵ چی هەیە کوا ئاشنە

من لەتەکیەی چاوەکانت سۆفی بوم
ئەمڕۆ تەرکی حەی لەرووت پێم مردنە

وەك زەمان ومێژوو خولیای رووی یەکین
کۆن وەکو گەوهەر لەدەریای بێبنە

باشەمی شەوبێ لەڕووتا جەستەکەم
تابفەرمووی شەو بەڕووت چەند رەوشەنە

دڵنیابی تا لەئەژنۆی خەم دەمێ
گەڕ لەمنداو تۆش بەکەین وپێ بکەنە

هەســـــــته توخـــــــوا رووی رەقیــــــب مەشـــــــکێنە دڵ
بانـــــەیێ گیـــان کێـــش لـــــەپێش تـــــۆ رووی منـــــە

تـــــــابزانی نێــــــــو قوتابخانـــــــەی عەشــــــــق
پـــــاکی ســــــەر دەســـــتەی قوتـــــابی (هێمنـــــــە)

پاکی
١٥ / ٦ / ٢٠٠٣

## وەرە قیبلەی هەمیشەم
## پێنج خشتەکی شیعری پاکی

ون وێڵـــــــــی خـــــــەمی دەریـــــــــای جـــــــەفاتم
قـــــــەدەر وابـــــــوو نـــــــەچێژم شـــــــاد کـــــــەهاتم
ببینـــــــە چـــــــۆن ســـــــوڕی گێـــــــژی نـــــــەهاتم
وەرە ســـــــــــــەرگێڕی نێـــــــــــوداوی بـــــــــــەڵاتم
منـــــــی کـــــــورد کـــــــۆن لـــــــە ســـــــێدارە راهـــــــاتم

* * *

شـــــــەوم رۆژبـــــــوو لەشـــــــەوقی کوڵـــــــی ســـــــووری
مـــــــاڵی دڵـــــــی چراخـــــــان کـــــــرد بـــــــە نـــــــووری
هـــــــەتا مـــــــابوو بەئـــــــەو مـــــــابوو ســـــــەبووری
بـــــــەکۆ دەردم لێ کـــــــۆ بـــــــوو هـــــــات کـــــــە دووری
وەرە قیبلـــــــەی هەمیشـــــــەم تـــــــا وەفـــــــاتم

* * *

بـــــــەخوێناوم گـــــــەر ئـــــــەم عەشـــــــقە گـــــــەرم کـــــــەی
شـــــــەقی بـــــــەرپێت لـــــــەڕێتا گۆســـــــەرم کـــــــەی
لەســـــــەر پێـــــــم جەژنـــــــە وەك مـــــــاچێ کـــــــەرەم کـــــــەی
غـــــــولام ودێـــــــم قەســـــــەم ســـــــەدجار دەرم کـــــــەی
گـــــــەدایم شـــــــأیە گـــــــەرلانم کـــــــەلاتم

* * *

وەتـــــای نـــــەیما بـــــەمن شـــــۆخ ســـبـــۆزو مـــــەیلێ
پەشـــــێوما دڵ خانـــــەویران بـــــوو (خـــــەیلێ)[1]
وەکـــــو مـــــەجنون کـــــەبوو مـــــەجنون بەلـــــەیلێ
بـــــێ زامـــــی نـــــوێ ســـــەرین ناکـــــەم چ لـــــەیلێ[2]
لەجـــــەورو کـــــۆی خـــــەمی تـــــۆ دڵ قـــــەڵاتم

* * *

بـــــەبێ گیـــــان کێبـــــوو رزگـــــاری لـــــەراوت
هـــــەمووی ســـــەر قـــــاڵ وبـــــێ هۆشـــــە لـــــەداوت
نەکـــــەی ســـــەرپێچی شـــــاهێدە دووچـــــاوت
کەچـــــەند پـــــێی دیلـــــە بـــــەو زولفـــــی هـــــەتاوت
هـــــەتا مەحشـــــەر غولامـــــی تـــــۆزی پـــــاتم

پاکی
٢ / ٤ / ٢٠٠١

خەیلێ: وشەیەکی فارسی‌یە واتە زۆر .
چ لەیلێ: ووشەیەکی عەرەبی یە واتە چ شەوێ .

## فرمێسکی سیحراوی
## پێنج خشتەکی شیعری پاکی

ئـــەوەی دیـــم چۆپـــی چـــەوتی گـــرت لەســـەر مـــەیدانی ئـــەو خاکـــە
بـــەدوو فرمێســـکی ســـیحراوی مـــەڵێ بـــوٚم مـــــات و غەمناکـــە
لـــە دورا ڕاســـتە بـــوٚ نـــیزیك خراتـــر زوٚر لـــە زوخاکـــە
بەشـــان و بـــاڵی کـــێ هـــەڵ دەم بڵێـــم ڕاســـتە و تـــەواو پاکـــە
نەکـــەی بـــڕوا لەســـەر کـــەس کـــەی ئومێـــد لـــە خـــوا تـــە مـــە نناکـــە

* * *

نـــەڕەنجی تـــا بـــە ڕوح ناگـــەی بـــەکاروانی ســـەربە ســـتی تـــوٚ
لـــە لانـــە شـــێر دەلـــەرزێ گـــەر بزانـــی لێی کـــە هەســـتی تـــوٚ
لـــە بـــازاڕی ژیـــان دوٚڕای خـــەیاڵ بـــی یاکـــە مەســـتی تـــوٚ
نەکـــەی چـــاو دەســـتی کـــەس بـــی خـــوٚ نەبەســـتراوە دوو دەســـتی تـــوٚ
ئـــەوەی بـــان گـــێری پـــایز بـــێ لـــە زســـتان بـــێ خـــەم و باکـــە

* * *

بـــوٚ خـــاڵی ســـەنگەری ڕاســـتی بـــراو هـــاو بـــیرو یـــەك دەســـت بـــە
هـــەتا مـــاوی لـــە ژیـــن تێنـــوی ســـەرچاوەی کـــانی زانســـت بـــە
لەشـــت باچـــاو بـــێ کـــوێ لاوە بـــە زیـــرو مـــەردو پـــڕ هەســـت بـــە
دەهـــەوڵێ ڕاکـــە تێکوٚشـــە بـــە ئـــازاری ژیـــان مەســـت بـــە
بەبرســـی نـــابێ لـــە ژیانـــا ئـــەوەی دوای نـــانی خـــوێ ڕاکـــە

عــەودالێ دوای دڵســـۆزێ بـــووم کـــەچی خـــەم هاتـــە باوەشمـــە
هــەمووی خــەندەی بــەحاڵم دێ کەبــەد بــەختی لـــە ژیـــن بەشمـــە
ئەگــەر بکــرێ دەبــات خوێنیــش ئـــەو دوو قاپـــەی لـــەناو لەشمـــە
لـــە داخـــی وان کـــۆی تانجـــەڕۆ کـــۆی کـــەی هـــەر فرمێســـکی گەشمـــە
ئـــەوەی وریـــا نـــەبێ حـــاڵی ڕوو بـــەئازار گیـــان هیلاکـــە

* * *

بـــۆ ســـووکی بـــاری ئـــازارت وەفـــای کـــام بـــوو بڵـــێ کـــێ یـــان
ســـەبارەت کـــارو کرداریـــان بـــووە دۆزەخ بـــەتۆ جـــێ یـــان
قەســـەم بـــە خـــوا بەهەشـــتە جێـــت ئەگـــەر پێـــدا نـــەچی ڕێیـــان
بـــەدەردی قەومەکـــەی نـــوح چـــن ئـــەمن دوعـــا دەکـــەم لێ یـــان
لـــە فێڵیـــان ڕێـــوی سەرســـامە لـــە گـــەڵتا کـــاتێ ڕەفتارکـــە

پـاکی
٥ / ٦ / ٢٠٠٢

## شمشادی قەدت

## پێنج خشتەکی شیعری پاکی

کـــــه شمشــــــادی قــــــەدی تـــــــۆ قــــــەد ئالآیـــــــه
بـــــــــۆ قوربـــــــــانی ســــــــــەری زۆری ڕێدایــــــــــه
ســـــــێدارەم دە لـــــــەبالآت تـــــــــۆش کـــــــه وایـــــــه
مەترســــــــه کـــــــورد لـــــــه مێـــــــژه حـــــــاڵی وایـــــــه
لـــــــه ســــــــەر بێشـــــــکه ئـــــــەوەی بـــــــۆ ســـــــازکرایه

* * *

بەلەنجـــــــــــەو ڕووی‌درەخشـــــــــــانت کـــــــــــەهاتی
گـــــــولآو پــــــــڕژا عــــــــەتر بـــــــاری لــــــــەباتی
دەمــــــەو زســــــتان بــــــه گوڵــــــزار بــــــوو لــــــەجیاتی
خـــــوا هـــــەڵ نـــــاگرێ بەســــــەر لایـــــق خـــــەلآتی
کچـــــــی کـــــــورد ئـــــــای بەهەڵوێســـــــت و وەفایـــــــه

* * *

مــــــــن ووتم نــــــــەبووە لەشــــــــەو ڕۆژ بێتــــــــەوە
ئــــــــەو ووتــــــــی ڕۆژە کــــــــەیار هەســــــــتێتەوە
زامــــــــی خەســــــــتەی شــــــــەو ووتم دەکولێتــــــــەوە
ئــــــەو ووتــــــی نــــــا دووری کێــــــو دەتوێنتــــــەوە
خەســــــــتەی دڵ زولفــــــــی تاتایــــــــه کــــــــا تایــــــــه

* * *

بۆتــــــــی تـــــــای زولفــــــــــی دزی ئـــــــــەم نــــــــێرگزە
بـــــۆ یـــــە ئاســــــتی ڕوو کـــــە ســــــەر شــــــۆڕو کـــــزە
خونچـــــە پشـــــکوت چـــــەند بـــــەهار هـــــات بـــــەو بـــــزە
راوی ســــــــینەی توشــــــــە پێــــــم لــــــەو چیــــــاو ڕەزە
هـــــــەموو کــــــاتی بەجەژنــــــە کــــــێ تــــــۆی لایــــــە

پاکی
نەورۆزی ۲۰۰۳

# دەمی تەنگە

ڕۆژی ڕەش وبەختی ڕەش وچاوی ڕەشم لێ بەجەنگە
کەتۆ دووری لەحاڵی من هەقە واتێ نەگەی ڕەنگە

لەڕۆژی بوونی سەرچەرخا لەنێو زیندانی ئەو مەرگەم
ئەتۆ گێژاوی داوێك و بەمن مەینەت هەزار ڕەنگە

هیواو ئاسۆمە خنکاوە لەژێر هەوری ڕەشی تاری
وەکو ڕۆژم گیرابێ ڕەش دڵم کوشتەی شەوە زەنگە

لەدەریای چاوی پڕ سحری مەلول و مات وداماوم
لەترسی لەشکری موژەی دەڵێی جەیشی کۆی فەڕەنگە

هیوای دڵ زۆرە وەك تێنو بەئاوی سوێرو دەرنابەم
دەمێ کوژراوی ئەم چەرخەو دەمێ کوشتەی دەمی تەنگە

وەکو تیری ڕەقیب تیری نیگای بوو خەستە جێی کردم
وەرە سەیری بەهێی دڵ کە بزانە چۆن بەخوێن ڕەنگە

لەحەشرا تا بێ شاهێد لەسەر لاشەی نەناسراوم
کە(پاکی)کوشتەتیری دەست پەری کوردی، شۆخ وشەنگە

پاکی

٩ / ١١ / ٢٠٠١

# کوشـــــتنم

کوشـــتنم بێ‌تـــیرو ڕم بـــوو کوشـــتنم بــــەو دوانــــە بـــوو
لەشــــکری نیگـــای لـــەلایێ دوو بــــەمن ئـــەو دووانــــە بـــوو

هــەرچی ناســکە شــۆخم فــەرمووی ســەر بەســەرجەرگی بڕیــم
گــەرچی بـــۆ ناحـــەز هـــەموو کـــۆی پــەند و واژە و وانــە بـــوو

ســـۆفیەکەی بێ‌هۆشــی دەم پـــای قامـــەتی ئـــەو شـــۆخە بــــووم
شـــاهێدم پێـــش چوونــــە خزمـــەت حـــاڵی مـــن قـــەت وانـــەبوو

دوای دڵـــی ســـــەرگێری بـــالاّی کردووپــــێ‌ی فـــەرموم مـــەڕۆ
کوشــــتە غـــەمزەش مـــاوە هێشــتا تـــیری کۆتـــاو دوا نــــەبوو

نــــەمدەزانی هـــــەوری قینــــەی ڕێژنــــە تـــیری رووم دەکــــا
وەك ســــــەفاح خانــــــەوێرانی‌کا وەهــــــا پێـــــم وانـــــەبوو

چونکــە پــەیمان نوســی بــــەخوێن ئــالّی گــەش فرمێســکی چـاو
ســـوێند بـــەچاوت بـــاوەڕت بێ‌خـــاڵی وای تیــــادا نــــەبوو

هـــات حـــەکیمێ ژیــــر بـــەحاڵی زەردی شـــێوای رووم ووتـــی
مـــەرگی زەق هـــۆی تـــیری گفتـــی شـــیرنی ئـــەو دەم دانـــەبوو(٥)

پاکی
٢٠٠٢ / ٤ / ٤

(٥) ئەو دانە بوو واتە : ئەوکاتە بوو .

## کەم نەزان

دەر بـــــەدەرخۆم وێڵـــــی شـــــۆخ بـــــەو دەشـــــتەوە
دڵ بـــــەزامی بارگـــــە تێـــــك نـــــای دەچـــــەوە

زامـــــی داغـــــی شـــــیرنە قاقـــــای مـــــاوە پێـــــم
مـــــاکی داغیش چـــــەندبێ کۆن کوادەچتـــــەوە؟

هەســـــتی ژانـــــی دووری ناکـــــا کـــــەم نـــــەزان
بـــــەس بـــــۆ درکـــــێ دەگـــــری ژێـــــر پـــــای چەقتـــــەوە

تـــــۆ کەفـــــەرهاد نـــــی لەســـــەرکردەی عەشـــــق
ســـــوارە ســـــواری چیتـــــە بـــــەدڵی ڕەقتـــــەوە؟

مـــــاوە مـــــەدهۆش سەرلەپیشەی شـــــۆخەکەم
راوچـــــی یـــــە تاکـــــەی لەکوشتەی قەســـــتەوە

لەشـــــکری دەرد چـــــی نـــــەکرد پێـــــم ئـــــەو نـــــەبێ
هـــــات کەپەخشـــــی کردکەزی ولێـــــك بەســـــتەوە

کـــــۆی هیـــــوام خنکـــــا بەســـــەرچوو ماوەیـــــەك
گـــــەربێ جـــــار جـــــارخۆڵی گڵکـــــۆم پەســـــتەوە

هـــــەرچی کـــــردت چاوەکــــانت خــــۆش بـــــەڵام
دەردی وا بــــــۆ (پــــاکی) خــــوێ ناناســـــــتەوە؟

پاکی
١٨/٩/١٩٩٦

# هەوری ڕەش

زۆر شـــەوی تـــارم ڕۆنـــا دی دڵ گـــری ئەی نەکرایـــەوە
جـــەنگی عالـــەم کـــۆی بەســـەرچوو باســـی مـــن نەبڕایـــەوە

دەردی زۆر ســامناك و دژوار، چـارى بـــۆ هـــات و نـــەهات!
کـــەس بـــەدەردم مـــوژدە بێنـــێ چـــاری بـــۆ دۆزرایـــەوە

بۆخـــەمێ ورد زۆر دەشـــێوێ شـــوێن بـــە خـــۆی نـــاگری دەمـــێ
ئـــەی ســـەری‌من ســـەربەکوێ کـــا کـــۆی ڕەقیـــب بەدوایـــەوە

خۆشـــی‌دوێنیم چـــوو بـــەتاڵی پـــێرێ، ئـــەمڕۆش بـــۆ ســـبەی
مەینـــەتی وەك خـــۆر بـــەدەورم ڕۆژ و شـــەو ســـوڕایەوە

گیـــانی شـــیرین زۆر گـــڕی گـــرت یاســـوتا یـــا بـــووی نـــەجات
کـــێ وەکـــو مـــن کـــوا بـــەگڕما چـــەق لـــە مـــەیدان مایـــەوە

ئەســـپی پڕتـــاوی دڵـــی مـــن لەشـــکرێ نـــەیگرت بـــەلاّم
یـــار بەیـــەك تـــای داوی زولفـــی دیلـــی کـــرد بەســـتایەوە

نــەم گــەرەك بــوو وەســفی زامـــی دوێنـــێ ئــەمڕۆ چارەیـــێ
قـەردە کۆنـە چـوو کـــە ڕۆیــی کــێ بــوو هــات کــاش دایــەوە

نــارِەوای ئــەم چەرخــە (پــاکی) چیــدی بــاس ناکـــا کـــەدی
خۆشەویســت هــات خۆشەویســـتی کـــردە دوو ژێـــر پایـــەوە

پاکی
١٩٨٦/١٠/١٠

## ســــەردان

رۆژێ فــــەرمووی یـــــار بـــــەحاڵم دێ کەســــــەردانم دەکــــا
مــــەیلی ســــەیرانی بــــەهاری خۆشـــــی جـــــارانم دەکــــا

شــــەو نەنووســـــتم بـــەو خەیاڵـــە خوایـــە کـــەی ڕۆژ بێتــــەوە؟
بـــاڵی(هومـــا)ی کــــا بەســــــەرما و بـــەڵکو دەرمــــانم دەکــــا

کاتـــێ لــــەنکاو هـــات بـــەمووژەی تیـــژی وەك تـــیری عــــەدو
نــــەم دەزانـــی یــــەك لــــەدوو یــــەك ســــینە نیشــــانم دەکــــا

خۆشــــی وەی بــــووم زامــــەکانم وەك خەناوکــــە کــــا لــــەمل
نــــەم دەزانـــی ســــەنگی حــــەمرین خــــەم لەسەرشــــانم دەکــــا

شــــادو دڵ خۆشــــی ئــــەوەی بــــووم ڕووی بــــەهارێ بــــۆن دەکــــەم
نــــەم دەزانـــی دێ بەشــــینم فەســـــڵی زســــتانم دەکــــا

شــــادی وەی بــــووم دێ لــــە قوربــــان دیــــاری دێنـــێ بــــۆم گوڵـــێ
نــــەم دەزانـــی بــــێ لــــە قوربــــان قۆچــــی قوربــــانم دەکــــا

خۆزگــــە هــــەر شــــەوبا بــــەحاڵم ڕۆژی وا تــــووش ، تــــووش نــــەبام
تابــــە کــــەی تێنــــوو بــــەماچی دەســــت ودامــــانم دەکــــا

پاکی
١/٣/ ٢٠٠٠

# چاوەکەت

چاوەکـــەت توخـــوا تەلیســـــمە ســـیحرە یاهــــەر جـــادووە
ئـــای کـــەچی کـــرد پێـــم لـــەخۆڕا نـــەبووە ڕووی ڕابـــووردووە

ســـەد دوعـــای شـــێخ چیـــم بەســـەرهات خوایـــە هـــۆش خـــۆم بێمـــەوە
کاتـــێ خـــۆم دی وەك دێوانـــــە لـــــەش لـــەبناری کـــــەوتووە

بـــانگی شـــێوان بـــوو لەبیرمـــە ئـــاڵودەی ئـــەم داوە بـــووم
هێنـــد شـــێوا بـــووم وام دەزانـــی تـــازە ڕۆژ هـــەڵ هـــاتووە

بـــووم نـــەجاتی فیتـــی چـــاوی بـــەس کـــەپێی کوژرامـــەوە
جەیشـــی مـــوژەی بـــوو لـــەدەورم لەشـــکری خـــۆی خســـتووە

قـــوڕ بەســـەر وەی دێ بـــەڕووتا ســـا بـــە دەردی مـــن دەچـــێ
ســـەیری شـــینی دەشـــتی چـــاوم چـــەند زســـتانی بەســـتووە

دەرنـــەچووی تاقیگەوانـــەی عەشـــقی تۆبـــێ (پـــاکی) یـــە
وەك قوتـــابی تـــازە دەورەی ئـــەلف و بـــای وەرگرتـــووە

پاکی
١٩٨٨/١/١٥

*****

## بۆبەندە شێتە

ڕۆژ کوڕنوشی بۆ نیگای چاوتابێ
بۆ بەندە شێتە دین بەڕووتا بێ؟

خاڵێ لەگۆنات مولکی شا بێنی
بۆگەدا، شێتە چاو لەڕووتابێ؟

کۆی شیفای دەرد بێ بۆنی تای زولفت
بۆخەستە شێتە کەوتەی پێتابێ؟

سینەت وەك باخ و گوڵزاربێ بۆچی
دڵ شێتە شەیدای بەهێی دووتابێ؟

خەندەت بێسۆمای بینای دیدە بۆ
نابینا شێتە ماڵی ڕێتابێ ؟

پاکی
١٥/٤/١٩٩٠

## دێوانە خۆم

بــــــــەو هــــــــەردو زورگ وداڵــــــــەدا
بــــەو شـــــاخ وکێـــــو قـــــەد پاڵـــــەدا

وێــــــڵ و دێوانـــــــە خـــــــۆم بــــــەدوای
ئەوناســــــــکە شـــــــۆخ چاوکاڵـــــــەدا

ســــــۆزی شمشـــــاڵی شـــــوان نی‌یـــــە
هــــــەر ناڵەمـــــــە بـــــــە ناڵـــــــەدا

بــــــەلاّم چبکــــــەم بەچرپــــــەی گوێی
کەســـــــێ نایـــــــێ لـــــــەو حاڵـــــــەدا

تـــــیر خوێنـــــاوی جـــــەرگی نـــــەکرد
وەك دای بەشـــــــان ئـــــــەو شـــــــاڵەدا

والاّ نـــــــــەبا ســـــــێو لەســـــــــینەی
چیـــــم لـــــەو گرنـــــە منداڵـــــەدا؟

تــــــەوقی ریشـــــــەی ئـــــــەڤینی گـــــــرت
وەك ئـــــــەو بـــــــازن و خرخاڵـــــــەدا

وەفــــــای هــــــەبا ئــــــەمن و شــــــەراب
چیـــم بـــوو بـــەو تفـــت وتاڵـــەدا؟

بـــــــــزەی هاتـــــــــێ دەڵێـــــــــن ســـــــــاتێ
کـــــــە تـــــــوام لـــــــەرێی ئـــــــەو زاڵـــــــەدا

پاکی
١٩٩٦/٥/٥

## رووی بەهێم

کـــــەی لێـــــوی وشـــــکم ســـــەر لێـــــوی تـــــەڕی
ســـاتێ جـــــووت دەبـــــێ دەمـــــێ نـــــەك هـــــەردەم

کـــــەی بـــــۆن دەکـــــەم رووی پـــــەڕەی گوڵـــــزاری؟
بـــــڕوا ئـــــازارم دەرچـــــێ هـــــەڵێ خـــــەم

رووی بـــــەهێم کـــــەنگێن ئـــــاڵ دەبێتـــــەوە
بـــــەماچی کوڵـــــم و بۆتـــــی ســـــینە و مـــــەم

کـــــەی لـــــە گـــــەردنما دەبـــــێ بئـــــاڵێ
کـــــەزی درێـــــژ و ئەگریجـــــە و پەرچـــــەم

داخـــــی گـــــرانم بـــــەم ترســـــە ســـــەردەنێم
مـــــن لـــــە رێـــــی عەشـــــقا هـــــەروەك زیـــــن و مـــــەم

پاکی
١٩٨٩

# بینایی چاوم(*)

بینایی چاوم گۆشت و ئێسقانم
شەمامەی ڕەنگاوڕەنگی بێستانم

مەرهەمی زامم چاو ڕەشەی مەستم
کۆترەی ناو ماڵم شیعر و هەڵبەستم

ڕەشە ڕەیحانەی باخچەکەی ماڵم
گۆتا پەمبەکەی ناسک وئاڵم

خەم ڕەوێنەکەی دڵەی پڕ زارم
نێرگزی تازەی جەرگەی بەهارم

بولبولی دەنگ خۆش گۆرانی وئاواز
بەفراوی ڕێگەی زۆر سەخت و هەوراز

فەرخە کەوی سەر بەرزی لوتکەی شاخ
لای‌لایەی دڵی پڕ لە زام و ئاخ

گۆچانی دەستم چرای شەوە زەنگ
خونچەکەی هیوام گوڵی ڕەنگاوڕەنگ

پێکی شەرابم مەزەی شەوانم
برنۆی سەنگەرم تیرو کەوانم

خونچەی پشکوتوی دەمی کازیوە
سروشت وێنەی تۆی هەردەم نەدیوە

ئەی هەگبەی پشتم لە چیا کە شوانم
بلوێری دەستم پرێسکەی نانم

خورەی قەڵبەزەی، هاژەی، بەفری چیا
قاسپە کەوی دوور لە نەغمەی جیاجیا

تیرو شمشێری پشت کەندوی ژیانم
ئەسپی پڕ تاوی جەرگەی مەیدانم

خەوەخۆشەکەی دوای ماندو بوونم
پارچە گەوهەری ژێر دەریای روونم

هەی چەپکە گوڵی نازدار و رەنگین
وەنەوشە و، کنێر شەوبۆ و، یاسەمین

سونبول و، مێخەك، نێرگز و، لالە
شەونم، و شیلان، مینا و هەلاڵە

حاجیلــــــــه، بیمـــــــــار ، چنــــــــور و ، نازنـــــــاز
نەســــــــرین، و شـــــــەهلا، بـــــــەیبون و شــــــاناز

مـــــانگ بـــــەهۆی رووتـــــان بـــــه شـــــەو رووناکـــــه
رۆژ لــــــه بـــــەر رووتـــــان بێ‌تــــــرخ و باکـــــه

گەشـــــــــه ئەســــــتێرەی ئاسمـــــــــــانی روونم
بـــــــەنده بـــــــه ئێـــــــوه بـــــــوون و نــــــەبوونم

وەهـــــا دەســــــووتێم بــــــۆ رووتــــــان وەك شــــــەم
ئـــــــەو داخـــــــه لـــــــه دڵـــــم دەرنــــــاچێ تاهــــــەم

ئەگـــــــــەر جیـــــــــهانیش بکـــــــەم بەپـــــــــەڕاو
خـــــــەم وئـــــــازاری پـــــــێ نـــــــابێ تـــــــەواو

رۆژێ دێمــــــــــەوه ناوتـــــــــان لـــــــــ، ســـــــــاتێ
تـــــــێر لـــــــه باوەشـــــــتان دەگـــــــرم لـــــــه کـــــــاتێ

ئـــــــەو دەمـــــــه هـــــــەرچی پـــــــەژاره وخەمـــــــه
قوربـــــــانی مـــــــاچی ســـــــەر کوڵـــــــم و دەمـــــــه

رۆمانیا ١٩٩٥

(*) ئەم هۆنراوه پێشکەشه به رۆڵـه خۆشەویستەکانم (رێنـاس وئـاهی وچـرۆ خـان) وه هـەموو منداڵـه لێـو بەخەندەکانی وەکو کۆترەی ئاشتی که زینده به چاڵ وبن بوو کران لەســەرد،می رژێمـی بەعسـی گـۆڕ بـەگۆڕ چوو.

## خۆشەویستم
## شەش خشتەکی شیعری پاکی

خۆشەویستم وا بەهار هات بۆچی تۆ لێم بووی جیا؟
خونچە گوڵ وا هاتە پەیدا سەوزە دەشت و کێو چیا
خەڵکی تاك تاك و بەکۆمەڵ دەچنە دەر بۆ نێو گیا
دەستی یەك دەگرن بە خۆشی و شایی و ، چەپڵە ، و دڵنیا
ئای چ رەنگینە بەهەشتە بسرەوێ گەر دڵ تیا
کێ دەڵێ جەننەت وەهایە خۆشترە زۆر بێ ریا

* * *

دەستەیەك دەچنە وەنەوشە و نێرگز و سەر لوتکە شاخ
کۆمەڵێ دەچنە نزار و چیمەن و ناو شیوو باخ
پڕ بە دڵ بۆ یەك بەئاوات یەکترین بۆ یەك بە داخ
دەردەکەن هەرچی لە دڵدا کۆی هەیانە قین و یاخ
من نەبێ تەنها دەناڵم بەو دڵەی پڕ دەرد و ئاخ
بۆیە پەست و دڵ حەزینم بوو بەشم بەختی سیا

* * *

دەردەکـــەم قـــورس و گرانـــە بۆیـــە رووم دوور شـــاری‌یە
تـــیری ئەبرۆکـــەی لـــە ریشـــەی جـــەرگ و دڵمـــا کاری‌یـــە
کـــوێ دەرۆم پێـــم دۆزەخێکـــە و خوێـــن لـــە چـــاوم جاری‌یـــە
چیـــم بـــە خۆشـــی خەڵکـــە قوربـــان واکـــە بـــۆم خـــەم باری‌یـــە
دادەنیشـــم دەســـت بـــە ئـــەژنۆ کـــەی ئەمـــە دڵداری‌یـــە
دۆزەخ و ئـــاگر ســـەفایە پێـــم ئەگـــەر تـــۆی بـــێ تیـــا

* * *

دولبـــەران کـــۆی بـــەرگی ســـەوز و زەرد و شـــینیان پۆشـــی‌یە
لێـــو بـــە خـــەندە و دڵ گوشـــاد و پێکـــەوە مـــەی نۆشـــی‌یە
چـــەپکێ گـــوڵ نـــێرگز بـــەیادی لەیلەکـــەی سەرکۆشـــی‌یە
پڕخـــەیاڵ و مەســـت بـــە تێکـــڕا پێکـــەوە بـــێ هۆشـــی‌یە
بێ‌بەشـــت کـــردم عـــەزیزم لـــەم بـــەهار و خۆشـــی‌یە
روون دەبـــێ چـــاو کوێـــر بـــەجاری‌بێتوو گـــەر بـــڕوا پیـــا

* * *

جـــا بـــەهار زانـــی کـــەحاڵی (پـــاکی) شـــێوایە گــــەڵێ
پەســـت و خـــەمبارە لەگۆشـــەی بێکەســـی دەردی دەڵـــێ
مـــات و بـــێ چـــارو کەساســـە قـــەت نەرســـکا بـــۆی هـــەڵێ
ســـەختە بـــەو حاڵـــە بـــە ئـــاوات ئاســـۆی خۆشـــی لێهـــەڵێ
بۆیـــە رەنـــگ زەرد بـــوو لـــە تـــاوا زوو بـــەڵێنی دا هـــەڵێ
ئـــەو جـــەفای یـــار دای کـــەپێما نـــەبووە قـــەت بۆمـــن شـــیا

پاکی

١٢/ ١٠/ ١٩٨٠

برادۆست / سیدەکان

## پێ ی بفەرموو

پـــێی بفـــەرموو لێـــم نـــەدا بـــا چاوەکـــەت چیـــتر مـــوژە
بـــێ مـــوژەش خـــۆ دەمکوژێـــتن چونکـــە چـــاوت دڵ کـــوژە

زولفەکـــەت دەرچـــوو لەدەســـتم بـــوو بەتـــەوقی گـــەردەنم
نـــەم شـــێواندوە جووتـــە مـــاری ڕەش لەبـــەرچی وادژە؟

مـــن گـــەلاوێژم گـــەرەك بووبۆیـــە ڕووی خـــۆم هـــەڵ بـــڕی
گوێـــم لەخـــەڵکان بوودەیـــان ووت دیارکـــەوت کـــاروان کـــوژە

خانـــەقا پڕبوولەســـۆفی شـــێخ ووتـــی شـــەو نوێـــژ بکـــەن
چونکـــە ئـــەمڕۆ دی کـــەلێوی لێی دەبـــارێتن بـــزە

ســـاکەوابێ مـــەی لـــەبۆچی مەســـت کـــەبم بەوحاڵـــەوە
نامـــەوێ ڕووی ســـاقی چیـــتر چاوەکـــەی گـــەربێ مـــەزە

بۆیـــە پەنـــهان زۆر بەکەیفـــە شـــەو بـــەلای چـــوم بـــۆژوان
تـــاکو بگـــرێ ئۆقـــرە دڵ بـــەم ســـینە وەك بـــاخ وڕەزە

بیرمـــە دەردێ وای بـــەحاڵم کـــرد لـــەژێر گڵکـــۆش نـــەچێ
یـــائیلاهی عەکســـە چـــەند ئـــەو شـــۆخە ئـــەو کارمـــامزە

تــــاڵی دونیـــا م گشــــت بـــەیادی نۆشــــی  هێشـــتاکە منیـــش
هــــــەر تـــــاوانم زۆر بەیاســــای بۆیـــــە دڵ لێی دێ کــــــزە

دۆســـتەکان بـــەم جەژنـــە توخـــوا ئـــاهی ســـەردم حاڵی کـــەن
وەك ڕەقیـــب بـــۆ هـــەر لەبـــەختم ڕەق دڵـــی ئاســـن مـــزە؟

هــۆش وگیــان وخوێنــی بــردوم (پــاکی) چی‌ماکــەی دەبـــێ؟
ڕاســـتە حاکمـــێ بـــێ لەمـــەیدان حوکمـــی‌دا ئـــەودڵ دزە

* * *

ئەم پارچە هۆنراوەیە تێك هەڵکێش لەگەڵ عبد الکریم شیخ باقی لە ساڵی ١٩٩٨ دانراوە.

# شیعری پاکی
## لەسەر پێنج خشتەکی شیعری صافی هیرانی

لـــەلات دونیـــا وەکـــو دۆزەخ ئـــەتۆش ســـوتاوی تیـــا نـــاوی
دەمـــێ زوو ئـارەزووی مـــەرگی و دەمـــێ لـــەو چەرخـــە ڕامـــاوی
لەســـەر پشـــکی نـــەبوون و بـــوون چی‌یـــە بـــێ گفـــت و ورمـــاوی
وەکـــو کوشـــتەی قەســـاب ئـــەی دڵ چی‌یـــە واغـــەرقی خوێنـــاوی
لەگۆشـــەی بێ‌کەســـی دائیـــم لەغـــەم دا مـــات و دامـــاوی

*   *   *

کـــەهات جارجـــارە دەبینـــی مـــەڵێ غەمناکـــە ئـــەو شـــۆخە
لـــەتیری دڵ بـــەزام حـــاڵی کەچـــەند چالاکـــە ئـــەو شـــۆخە
لـــەبۆ دەردی دڵان ســـینەی حـــەکیم و چاکـــە ئـــەو شـــۆخە
ئەگـــەر فـــەرمووی لەقـــەتلی عاشـــقان بـــێ باکـــە ئـــەو شـــۆخە
هـــەزاری کوشـــتووە وەك تـــۆ قـــەدی لاولاوی لاولاوی

*   *   *

هیـــلاك نـــابێ لـــە هێرشـــی قـــەت بـــۆ ســـەر عاشـــق لـــە گشـــت لاوە
لەعەکســـی مـــن ئـــەوەی بـــەدکار بڵـــێ ئـــەم یـــارە وەســـتاوە
هـــەتا گڵکـــۆ منیـــش بۆیـــە ئـــەوەم هـــەڵگرتووە هـــەرماوە
چ ســـەیادێکە ســـەد وەحشـــی لـــە چینـــی پرچـــی پێچـــاوە
خەلاســـی تـــۆ نی‌یـــە ئـــەی دڵ لـــە داوی زولفـــی بـــاداوی

لــــەبێ مەیلیتــــە بــــێ مــــەیلم بۆیــــە ڕووی دۆســــتە شــــالاّوم
لــــە ڕووی لاوی نەوبــــەهاری بــــەڕووم پــــایزە ژاکــــاوم
ڕەق و لاوازو زەرد دڵمــــە بــــە ئەســــرین وەك کــــەتێرئاوم
ئەگــــەر فــــەرزەن نــــەیار بێــــتن ببینــــێ چــــارەیی چــــاوم
لــــەبۆ مــــن خوێــــن دەبــــارێنێ لەســــەر دووچــــاوەیی چــــاوی

* * *

وەرە ئــــەی دڵ بگــــەڕێوە بکــــە چــــووێ لــــەڕابردوو
بەزانســــتی گــــوزەر کــــە چیــــت لــــە هۆشــــی کــــۆن وبــــیری زوو
درۆیــــە مــــارەیی چــــەرخا بکــــا تاســــەر بەکــــەس گەرشــــوو
دڵــــە دێوانــــەیی خۆتــــە کــــە یــــاریێ مەیلــــە دەرهــــەق تــــوو
وەئیلــــلا ئــــەو لەســــەر ئــــەو عــــەهدە مــــاوە تــــۆ ئەگــــەر مــــاوی

* * *

دەڵــــێ قوربانــــە ئــــەو ڕۆژە لەبــــەرییێ شــــۆخ کــــە دێ دەرچــــی
لەســــەیری تــــێر بکــــەم ئۆخــــەی بــــەتۆ دونیــــا تیــــای هــــەرچی
گــــەدای وەك مــــن چییــــە توخــــوا لــــەڕێ بــــۆی گیــــان وگــــەر ســــەرچی
لەتــــەعریفی بڵێــــم چــــی بــــا قەڵــــەم دەرچــــێ بڵێــــم هــــەرچی
تــــەواو نــــابێ بــــەبێ ئەوســــافی پێچــــی پەرچــــەمی خــــاوی

* * *

دیســـــان وا هـــــەوری بـــــەد بـــــەختی بەســـــەرما گـــــرژی وەك بـــــاران
دەزانم لـــــەبری ئـــــەو عەشـــــقەی پڕیشـــــكی پەڕیـــــە ناوشـــــاران
دەســـوتێ (پـــاكی)بـــۆی هـــــەروەكو زەمـــــانی كۆنـــــی زووی جـــــاران
مـــــەڵێن (صـــــافی) كـــــە ئێســـــتێكە لـــــەیادی یارنی‌یـــــە یـــــاران
لـــــەدڵدا فیكـــــری دڵـــــدار و لـــــەناوی زیكرەكـــــا نـــــاوی

پاكی
٢٠٠٢/٢/٢٨

## مـن و دڵ
## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری صافی هیرانی

بەنەشـــئەی چـــاوی پـــڕ ســـیحری لـــە تـــەقواو زیکـــرو حـــەی کردیـــن
ئەشـــــەمبیلا چـــــەند کـــــرا پێـــــی بـــــێزاری ئـــــەو ڕوحـــــەی کردیـــــن
حـــەکیمی زام بـــوو بـــۆ چـــاریش وەلێ هـــــەر کەیفـــە نـــەی کردیـــن
بەغـــــەمزەی چـــــاوی مـــــەخموری ســـــیاهی مەســـــنی مـــــەی کردیـــــن
بـــــەماچی لێـــوی موســـــتەغنی لـــــە ئـــــەنواعی مـــــەزەی کردیـــــن

* * *

لەشـــەم چیـــم دا لەشـــەو شـــەم بـــێ قـــەندی گۆنـــای ڕونـــاهی مـــن
لـــەباغی ســـینە ســـێو نـــەگرم بـــەمن چـــی بۆنـــی کـــاهی مـــن
شـــەقی بـــرد خونچـــە کـــاتێ دی دەمـــی تـــــەنگ ئـــاڵی مـــاهی مـــن
تـــــرازا بـــــەندی ســـــوخمەی ئـــــاڵی گوڵنـــــاری بـــــەئاهی مـــــن
کـــــەچی دەســـــتی لەســـــەر دانـــــا لەســـــەیری بـــاغی بـــەی کردیـــن

* * *

کـــە دیـــم زولفـــی بـــەناز بـــادا ڕەتـــاندی هـــــەوری ناخۆشـــــی
بەلێشـــاو هـــات بـــزەو خـــەندە ئـــەوەی بـــۆ عاشـــــقە خۆشـــــی
لەســـەر یـــەك پـــێ وەکـــو نـــێرگز لـــە بـــۆم بـــرد ســـەر بـــە کڕنوشـــی
بەهـــــەوری پەرچـــــەم و زولفـــــی ڕوخ و ئـــــەبرۆی کەداپۆشـــــی
لەشـــەوقی ڕوئیـــەتی بـــەدری هیـــلالی یـــــەك شـــــەوەی کردیـــن

لــــەڕووی زیکـــــرم وەکـــــو شـــێخێ لەخـــــەڵوەتدا بەپەنـــــهانی
داخـــی گـــــرانم بـــــە چـــاوی دۆســـــت لـــــەمن جـــاریٚ کـــەناڕوانیٚ
خـــوا هـــەڵناگریٚ ئـــەو لـــە ناڵـــەم بـــێزار نـــابیٚ وەك گۆرانـــی
ئەگـــەر چـــــی کوشـــتنی خـــۆ قـــابض الأرواحـــی موژگـــانی
بـــەقانونی مەیســـحایی بەخـــەندەی لێـــوی ـئـــەی کردیـــــن

* * *

هـــەتاکو مەســـتی دورپەســـتی لەهەســـتی دەکـــریٚ پێـــت ڕاکـــە
لـــە فێـــلٚ و مـــەکرو داوی یـــار جیـــهان سەرســـام و غەمناکـــە
وەفـــای یـــاران نـــەما (پـــاکی) وەرە ســـەیریٚ لـــە دونیاکـــە
دەوایـــــی دەردی دلٚ (نـــــاری) لەتاهیربـــــەگ تەمەناکـــــە
بڵـــیٚ ئیمـــڕۆ گوڵندامـــیٚ بـــەتیریٚ جـــەرگی پـــەی کردیـــن

١٠ / ١٠ / ٢٠٠٠

## لە دوگمەی سینە

## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری نالی

لەسینەی تۆ پێکەنی گوڵ خونچە دوان
پەری خوایش لەڕووت بوو مات کە شێوان
ئەمەش بەڵگە سروشتت جیا لەچاو وان
لەدوگمەی سوخمە دوێنی نوێژی شێوان
بەیانی دا سپێدەی باغی سێوان

* * *

کاتێ کوڕنوشی فریشتە برد کە پێت
تاجی هەڵدا شا گەدا ئالا لە پێت
مانگ لە شەرمی ڕووتە شەو بەدزی کەدێت
لە ترسی تەلعەتت ڕۆژ هەر وەکو شێت
بەڕوو زەردی هەڵات و کەوتە کێوان

* * *

کە مەستی کرد بەداوی زولفی شەوبۆ
تیر بارانی جانیگای خستە ئەستۆ
کە نەمدیبو لەمەوپێش زامی ئەو تۆ
مەکە لۆمەی پەشێوی دڵ کە ئەمشۆ
پەشێواوە لەبەر پەرچەم پەشێوان

* * *

قـــــەفی زولفـــــی وەك و مــــار ترســـــی بـــــێ شـــــکن
ســـــوپای عاشـــــق بۆیــــە دەوری لـــــە ئێشـــــکن
بـــــەزام هـــــەتوان لــــە بـــــۆ دەرد گـــــەر پزیشـــــکن
دو چـــــاوی مـــــن کـــــەوا ســـــەیلی سروشـــــکن
دەپێـــــون ئـــــاوی بـــــەحری خوێ بـــــە پێـــــوان

* * *

مـــــەڵێن تـــــاڵاوو دەردی دی لـــــە چـــــاڵی
جـــــەژن وابـــــوو (پـــــاکی) یوســـــف بـــــەحاڵی
لـــــەچاو (نـــــاڵی) بـــــۆ حەبیبـــــەی کـــــەناڵی
شـــــەڕابی لـــــەعلی ڕومـــــانی لـــــەناڵی
حەڕامـــــەبێ مـــــەزەی مـــــاچێکی لێـــــوان

پاکی

١٢ / ١١ / ٢٠٠٠

## چارەنووسی شاعیر
## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری هێمن

دڵـــم مســـتێ لـــە بەفرێکـــەو تـــاوی دوریـــش گـــەرمی بایـــە
بلێـــن بـــەو شـــۆخە حـــاڵی کـــەن کـــەبێ دوو رۆژ نەفـــەس مایـــە
دەمـــی تـــەنگی مـــەزەم کـــا گـــەر چیـــم لـــە تـــاجی ســـەری شـــایە
بـــەهار بـــوو فـــەصلی زســـتانم ئەگـــەر یـــارم لەگـــەڵ بایـــە
درۆیـــە گـــەر گووتویانـــە بـــە خونچێکـــێ بـــەهار نایـــە

* * *

حـــەکیمی باوەشـــی گـــەرمی لـــەمن دوور تاســـەری رۆژێ
بوراقـــێ کـــوا لـــە کـــوێ بێنـــم بـــەر لـــە ڕوح دان بـــەری رۆژی؟
هـــەربۆ ئـــاهێ ســـینەی بـــۆن کـــەم لـــەڕۆخ دەشـــت و دەری رۆژێ
لـــەبارانێ مەپرســـە تاهـــەور بگـــرێ بـــەری رۆژێ
دەبـــێ بگریـــم هـــەتا ڕووی تـــۆ لـــە ژێـــر چـــار شـــێوی رەش دایـــە

* * *

کـــوا بەویســـتی تـــۆ بـــوو دانـــرا لـــە شـــیرن و تـــاڵ بەشـــت ئـــاخر
بەغـــەمزەت بـــەس لـــە خشـــتەت بـــرد ســـوپای ئەوشاهەشـــت ئـــاخر
ئەمـــەش هـــەر فیتـــی چـــاوت بـــوو بـــاری ئـــەو ئاهەشـــت ئـــاخر
هەناســـەم لادەدا چـــار شـــێوو روو بـــەندی رەشـــت ئـــاخر
هـــەور هەرچـــەندە پڕبـــێ کـــوا حـــەریفی قودرەتـــی بایـــە؟

ئەگــەر دڵ جــێی نـــەبووجێبێ دوور لـــەدونیای جوانـــی چـــاوت
مەکـــە لۆمـــەی دووره ســـایە لەســـای زولفـــی زەرد هـــەتاوت
کەنـــەفتی کـــێ دەڵـــێ حاشـــا وەکـــو زووی دەوری بـــوو بـــاوت
لـــەژێر ســـایەی برۆکـــەتدا حوکـــم رانـــی دەکـــا چـــاوت
لەســـایەی دۆخـــی شمشـــێره کـــە حـــاکم حوکمـــی ئیجرایـــە

* * *

ئـــەوەی فـــەرمووت ســـپی و پاکـــە بەوێنـــەی زولـــف و چاوتـــە ڕەش
لـــەلای کـــام ســـاحیرێ فـــێربووی کـــە داتنـــا داوی ئـــەو بەزمـــەش
زەمانـــەش ڕووی کـــە وەرگـــێڕا هـــەر دەســـتی تـــۆی تیـــا بـــوو لەمـــەش
لەســـــەر بـــــەفرێ بـــــەکار نایـــــە وەکـــــو بیســـــتومە داوی ڕەش
لەســـــەر کوڵمـــــەت ئـــــەدی بـــــۆ دڵگـــــره ئـــــەو بســـــکە تاتایـــــە؟

* * *

پێـــــم وانیـــیـــــە رۆژی ژمـــــار فریشـــــتەش تـــــۆ بتورێنـــــێ
مەگـــــەر بـــــالآت هیمـــــەتێ کـــــا کێـــــوی خـــــەمم بڕوخێنـــــێ
سروشـــت حـــــەددی چییـــــە وەك تـــــۆ لـــــەگوڵزار خونچـــــە بڕوێنـــــێ
هونـــــەر نـــــاتوانێ جوانـــــی تـــــۆ بـــــە هیـــــچ شـــــێوێکی بنوێنـــــێ
لەمەڕمـــــەڕ چـــــۆن دەتاشـــــرێ هەیکـــــەلی ئـــــەو بـــــەژن و بالآیـــــە؟

* * *

نــەبام بـــێ هۆشـــی ئـــەو لەنجـــەت بـــۆ چـــی شـــیرنە بـــەتاڵم دا
چـــەقیم شـــێتانە بـــۆ مـــەیدان بـــەڕووی زەرد رەنگـــی ئـــاڵم دا
کـــەچی مایـــەم بـــەیادی تـــۆ لەشـــاخ بـــەردێ پـــێی پـــاڵم دا
بـــزەت نایێتـــە تەســـەر لێـــوو بـــەزەت نایـــە بـــەحاڵم دا
ئەگـــەر چـــی زۆر لـــەمێژ ســـاڵە لـــەدوت دەخشـــێم وەکـــو ســـایە

* * *

لـــە ژێـــر هـــەر فەرشـــی ئـــازارە ئـــەوەی شـــەیداو بنـــاڵی تـــۆ
منێکـــی ڕووت حـــەماڵی ڕووت خـــەمم تـــاڵێ بمـــاڵی تـــۆ
کـــەچی مەرگـــەو ئۆخـــەم نـــەکرد لـــەبای زولفـــی شـــەماڵی تـــۆ
بەڕیشـــی بـــۆزەوە ســـوجدەی دەبـــەم مـــن بـــۆ جـــەماڵی تـــۆ
ئـــەدی بۆچـــی دەیـــان وت دار کـــەپیر بـــوو تـــازە دانایـــە؟

* * *

شـــکاتی حـــاڵی گەردوغـــە لـــەحوکمی نـــاڕەوای یـــارم
چبـوو ئـەو تـازە تـیرەی پێـم کـە هێشـتا زامـە هـی پـارم
رەقیـــب وەســـتا لـــە دوم و ئـــەو نەوەســـتا بۆتـــە خونخـــوارم
دەزانـــی بۆچـــی مـــن هێنـــدە پەرێشـــان و خەفـــەت بـــارم؟
لـــەبازاڕی ژیـــان غـــەیری هونـــەر نیمـــە چ ســـەرمایە

* * *

هەڵـــەم بۆچـــی دەکـــــرد بێتـــو قوتـــابی پـــۆلی خـــانی بـــام؟
گرفتـــار بـــۆ دەبـــووم پێشـــان ئـــەوەی ئێســـتا زوو زانـــی بـــام؟
ژێـــرە دەریـــای خـــەم بـــۆ دەبـــووم وەکـــو نـــوح کەشـــتیەوانی بـــام؟
بـــەتوتوش توشـــی مەکتـــەب بـــۆ دەهـــاتم مـــن کـــە زانـــی بـــام؟
خەفـــەت مەینـــەت کەســـەر حەســـرەت بەشـــی ئینســـانی زانایـــە

* * *

گـــەر ئومێـــدو هیـــوام رابـــرد، دەبـــێ شـــەر خـــوازی بـــۆ هـــەل کـــەم
کـــەچاری چـــار نـــەما ناچـــار دەبـــێ هەرخـــەم بەخـــەم حـــەل کـــەم
لەگـــەڵ ناخۆشـــی یـــەك مـــاڵ بم وەکـــو منداڵـــی لـــەر مـــل کـــەم
لەگـــەڵ چارەڕەشـــی و دورەبەشـــی و نەگبـــەت دەبـــێ هـــەڵ کـــەم
لـــەمێژە چارەنووســـی شـــاعیرانی کـــوردی هەروایـــە

**پاکی**
٩ / ٩ / ١٩٩٩

## تاوانی بێ هێزی
## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری هێمن

لەحەشریش ڕووی فریشتەی خوادەڵێم مافی ڕەوای بەندە
ئەگەر بێ شك دەزانم ها لە وێش وەك ئێرە بۆ پەندە
بەلاّم چیبکەم عەشقم خوایی بەڕوخساری وەتەن بەندە
لەکۆ ئەسرین دەبارێنم لەبۆ کوردی پەڕاگەندە
لەگەرمێن غەرقی عارەق بوم وچاوم هەر لە سامڕەندە

* * *

لەتی قامەت وەیاکوشتەی پەری شێوە بەهارێکم
دەگەم بەو خونچە یاناگەم لەمەش خاوەن گومانێکم
ئەگەر چی دوورە کچ شێخەو منیش بەو کێوە شوانێکم
منی زنجیر پسێن لێرە ئەسیری بسکی جوانێکم
زەمانە گەرچی ئالۆزو پەشێوە موو بەکەل بەندە

* * *

ئیشارەی دا بە چاو فەرمووی لەکوێ دەم ژوانە خۆشەویست
لە بێهۆشی نەچووم حاڵی مەبەستم بوو دەنا چم ویست
ئەئێستاش هەربەناوگوێما نەهات بۆچی وەکو پێویست
گوتی ئێوارە بازاڕێ وەرە ماچت دەمێ نەم ویست
هەڵۆی کوێستانی کوردستانم وناژیم بەدەستە ندە

* * *

بزانم گەر خەیاڵیتە دیی لەمەودوا دڵ کەتەنگ ناکەم
دەژیم ئاسودەتربۆخۆم لەگەڵ گەردون کەجەنگ ناکەم
لەجەستەی شوشە خەم خەرمان وەکوسەرمایە پەنگ ناکەم
دڵم سەد هێندەی دیکانەش بەنازبشکێنی دەنگ ناکەم
چ سودێکی هەیە کێیە بپرسێ دادو گازەندە؟

* * *

گەدا گەر پول و بەختی بێ بۆچی وێڵ و سەرگەردانە؟
کز ومات بۆ بەخەستەی جێ دەڵێ سەرکردەی دەردانە
وەك بەمەینەت سواغم درابێ لەکۆی هیوای دەست بەردانە
جیهان و هەرچی خێرو خۆشی‌یە بۆ هەڵ بژار دانە
بەقانونی تەبیعەت پاشەڕۆك خۆرە ئەوەی گەندە

* * *

نەبێ پشتی شکاو پشتە ئەوەی ژی هەر لەتەنیادا
چ ناکرێ پێی وەکو بەستراو یەکێ دەستی لەجێگادا
چەقی سینەی نیشانە بۆ هەموو تیرێ لە ڕێگادا
ئەگەر تاوانی بێ هێزی نی‌یە بۆچی لەدونیادا
بەشی من ماتەم وشینە بەشی خەڵکی زەماوەندە؟

* * *

جڵـــەوی ئەســـپی هـــەرچی‌لنگ دا لـــەڕووی شـــیعری هێمـــن شـــۆره
وشـــەی یاقوتـــــە خـــۆی خەزنـــە کـــەنامرێ قـــەت لـــەژێر گـــۆڕه
چی‌یـــە چـــەند ســـاڵ دەمـــێ یـــادی دەکـــەن هـــەردەم شـــیای کـــۆڕه
بـــەمردویش نیشـــانەی گوللەیـــە ئـــەو کەللـــە پـــڕ شـــــۆڕه
ئەوێســـــتاش دەرســـــی ســـــەربازی دەڵـــێ ئـــەو شـــاعیرەڕەنده

* * *

فەلـــەك لـــەخوێنی خـــۆت گـــەوزی ئـــەوەم ئـــاوات دەوێ‌لێـــت مـــن
وەرانـــدت شـــاگوڵی گـــەش بۆلـــەناو باخچـــەی هونـــەر (هێمـــن)؟
دەڵـــێ (پـــاکی) بکـــەم شـــەکوا و، ســـکاڵا و داد، لـــەلای کـــێ مـــن
ســـــەری تـــــەعزیم لەبـــــەرتۆدا نـــــەواندن فـــــەخره بـــــۆ هێمـــــن
بـــژی حـــاجی کـــە کێـــوی هیمـــەتت ســـەد هێنـــدی ئـــەڵوەنده

پاکی
١٩٩٩/٩/٩

## ڕێژنە

### پێنج خشتەکی لەسەر شیعری مامۆستا ( هێمن )

بـــۆ دڵـــەی مـــردوم (عیســـی) بـــەتا بـــەدەم دوان ببمـــەوە
نـــێرگزی ڕووت دەرخـــە بـــاڕووی دەشـــت و کێـــوان ببمـــەوە
دوگمـــە والاکـــە هـــەتا مـــن دەم بەســـێوان ببمـــەوە
تـــۆ بـــەڵێنم پـــێ بـــدە تـــا مـــن بـــەرەو ژوان ببمـــەوە
بم دەیـــێ مـــاچێکی تـــەڕ لـــەم لێـــوە بـــا جـــوان ببمـــەوە

* * *

قامـــەتت میحرابـــی دڵ کـــە بـــا هـــەڵی ڕووم گـــەر مەشـــین
چـــاوی پـــڕ ســـیحری فریشـــتەت جـــەرگی هێناومـــە هـــەژین
گـــەرچی دیلـــی نوکـــی تـــیری پاســـی ســـەرچاوی گەشـــین
دەســـتی لـــەرزۆکم هـــەتا تێدایـــە هـــێزی بـــەی گوشـــین
لێـــم گـــەڕێ تـــاوێ لـــەباغی ســـینە میـــوان ببمـــەوە

* * *

ســـاردە مـــاچی بیـــانی ئـــەمما شـــیرینە ژوانـــی ژێـــر کـــەپر
ترســـی زۆڵ و ڕووی پـــەژارە ڕەنگـــە نـــەڕوانی چیـــتر
وەك ئەســـتێرەی بـــەر تریفـــەی مانگـــە شـــەو جوانـــی پـــتر
شـــەنگە بـــێری بســـڕەوە فرمێســـکی بـــێ شـــوانی ئیـــتر
ڕەنگـــە هێشـــتا لـــەو چیـــا و زۆزانـــە بـــۆ شـــوان ببمـــەوە

* * *

ناهەمواری دەست ڕەشی بای ڕمانی پەرژینەم بەڵام
لاێی بەرلافاوی دەریای لەخول و گێژینەم بەڵام
ڕاوی ڕاکەی ئاهێ خۆشی هەوڵ و توێژینەم بەڵام
من گوڵی سەر گۆڕی ئاواتی لەمێژینەم بەڵام
ڕێژنەیکم لێ بدا ڕەنگە بۆ ژوان ببمەوە

* * *

بۆی بەتوتی بووم چی فەرموو هێشتا هەرمەیلی شەڕا
بۆ غەزال لاس بوو بەسینەی چوو پەلێ جەرگی بڕا
جا چی یە بۆ پەریە کوردێ شایێ (شەیداو) دین گەڕا
شێخی صەنعان بۆ کچی گاور لەئیسلام وەرگەڕا
من خەریکم بۆ کچە شێخێ پەشیمان ببمەوە

پاکی
١٩٩٨/٤/١

* * * * *

## کوردم ئەمن

## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری مامۆستا ( هێمن )

دێـــوەرەو پێخـــواس و برســـــی و گــــەرچی ڕووزەردم ئــــەمن
لادەدا گــــەر لایــــیٚ دۆزەخ ئــــاهی پرســـــەردم ئــــەمن
چـــەند جـــەفاو تـــاڵی ژیـــانم دی و هـــەمووی بـــوردم ئــــەمن
گـــەرچی توشــــی ڕەنجـــەڕۆیی و حەســــرەت و دەردم ئــــەمن
قـــەت لەدەســـت ئـــەم چەرخـــە ســـپڵە نابـــەزم مـــەردم ئــــەمن

* * *

بـــۆ چـــاوی شـــیرین فـــەرهادی وێڵـــی شـــاخ و قـــەد پـــاڵ نیـــم
کوشـــتەو پابـــەندی چـــاو ڕەشـــی چۆپـــی و دەســـت بـــەدەسماڵ نیـــم
بـــۆ شـــەو پـــەڕی دڵ دێوانـــەی چـــرای ســـەر گۆنای ئـــاڵ نیـــم
عاشـــقی چـــاوی کـــەژاڵ و گـــەردنی پـــڕ خـــاڵ نیـــم
عاشـــقی کێـــوو تـــەلان و بـــەندەن و بـــەردم ئــــەمن

* * *

وا بـــەڕووی خۆفـــرۆش و زۆڵ و دوژمـــن و ئەحمـــەق ئـــەڵێم
جـــا چییـــە لاشـــەم دەدەن گـــڕ پـــێی بەدوکـــەڵ حـــەق دەڵێـــم
هـــەرچی بیکـــا پـــێی پۆلامـــەو ڕووی شـــەهیدان زەق ئـــەڵێم
گـــەر لـــە برســـان و لەبـــەر بـــێ بـــەرگی ئیمرۆ ڕەق هـــەڵێم
نۆکـــەری بێگانـــە ناکـــەم تالەســـەر هـــەردم ئــــەمن

* * *

سـەر شـۆڕو ڕیسـوان ئەوانـەی پێـم دەڵێـن خـاکم نی‌یـە
بـۆ ڕەوای مـاف ترسـی شـیری دەسـتی زوحـاکم نی‌یـە
سـەر لـە قوربـانم بـە کۆمـەڵ بـۆ نەبـەز تـاکم نی‌یـە
مـن لـە زنجـیرو تـەناف و دارو بـەند بـاکم نی‌یـە
لـەت لـەتم کـەن بمکـوژن هێشـتا دەڵێـم کـوردم ئـەمن

**پاکی**

۲۰ / ۱۲ / ۱۹۹۸

## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری ( هێدی )

چونکــه ســۆزی دۆســت و خزمــان کــەم بــوەو نــەیماوە پێــم
هێنــد گــەڕام و چــووم بــەدونیا تــاکو داهــات ئــاوی پێــم
تــۆش کــه ســوڕمای مــافی خۆتــه حــاڵی ڕووم نــابێ کــه کێــم
هــەرچی کردم خــۆم لەگــەڵ خــۆم کــردو ئێســته دێتــه ڕێــم
کوشــتمی گــەردانی گــەردوون هێنــده زەبــرت داوه لێــم

* * *

بــێ محــەك وەك مــن کــەزەرد بــوو نرخــی زێــڕی پــێ مــەده
بابســووتێم کــێ لەســوتان هــات دەرم کــا ڕێ‌ی مــەده
شــایەنی زیــاتر لــەوەم خــۆم دۆڵ بــه حــاڵم لێ مــەده
لێــم گــەڕێ وام لێ بــێ مــافی خۆمــه دەســتی تــێ مــەده
لێی گــەڕێ بــاتێك شــکێم چیــتر نــەڵێم مــن ناشــکێم

* * *

چــووم بــەزاری شــێرو دەرچــووم ئــەو هەڵــەی ناکــەم چیــتر
بەســیه قوربــان لایــێ ســووتان خــۆم بەشــەم ناکــەم ئیــتر
چــی بــوو پاداشــتی بەقــەڵغان بــووم و بــۆ ســەریان چــەتر
مــن لــه کــردەی خــۆم پەشــیمانم لــه نــاکردەش پــتر
ســەر چلــۆن دەرکــەم لەدەســت ئــەو چارەنووســه چــۆن هــەڵێم

* * *

نــارەوای گـــەردوون بـــوو ئـــەمنی توشـــی داوی چەپڵـــــە کـــــرد
هــەر ئــەویش بــوو لێــم کشـــاوە دوای کـــە ئـــەمنی ڕەتڵـــە کـــرد
بــەس نــەزانی خــۆم بــوو خۆمــی وا تـــێ هـــەڵچوی کڵپـــە کـــرد
بــیری ســـادەی خـــۆم ســـەری شـــێواندم و ڕێــم هەتڵـــە کـــرد
خـــەڵکی لـــەو ئـــاژاوە هـــــەڵدێ مـــــن بـــــەرەو ئـــاژاوە دێـــم

* * *

ســـوچ و کـــۆی گۆشـــەو کـــەناری هـــەرمنم بـــێ جـــێ و شـــوێن
بـــۆ هـــەموو ناخۆشـــی هـــــەرمن بویمـــە ســـەرکردەو هـــەوێن
هەردەمـــەی جـــۆری کـــە دەمـــرم جوانـــە مـــــەرگ و دڵ تـــــەزێن
مـــن کـــەبازی ســـەرچیا بـــــووم و هـــــەڵۆی کەوشـــەن بـــــەزێن
ئـــەمڕۆ هـــەروەك کونـــدی هـــاتوم لـــەو کـــەلاوە نیشـــتەجێم

* * *

گیانـــە بـــازیم کـــردووە مـــەیدان ســـــەر لــــە پێنـــاوی ئەمـــەل
شـــوێن گـــەڕاوم زۆر گـــەلێ جـــێ بـــۆ کـــەمین و دەســـتی هـــەل
ترســـی ڕێگـــەم گـــوێ نـــەداوە بشـــکرێم گـــەر خـــاش و پـــەل
وای هیـــلاك و مـــاندوو کـــردووم باســـی کـــوردو باســـی گـــەل
ئێســـتا کـــاکۆل و کـــەزی و پەرچـــەم نـــەبێ لێی نـــادوێم

* * *

مـــەرگ و ژیـــن تـــاکو بەجووتـــە هـــەر لـــە هـــانوو چـــوون دەبـــێ
ئـــەو دەمـــە بـــۆ داخـــی دووریـــت پشـــت بـــە پیتـــی نـــون دەبـــێ
کـــاتێ ســـەر دەبڕێـــم بـــە عەشـــقت دڵ لـــە گـــەزی خـــون دەبـــێ
گـــەر لـــە نێـــو دەردو خـــەماندا خـــاڵی تـــۆم لێ وون دەبـــێ
مـــن دەچـــم پیروزەیـــەك دێنـــم لـــە جـــێی وی دادەنێـــم

مـــافی خۆیتـــی دڵ بــــەڕۆژگار مــــەیلی جــــەنگی گــــەر دەکـــا
چونکــــە دەســـتی نـــارەوای پێــم کـــاری ســـەد خەنجــەر دەکـــا
ناســـرەویٚ دڵ شـــەو چـــرۆی خــــەم تـــازە لـــەنویٚ ســـەرنەکا
حـــەز دەکــــەم دەردێکـــی بگـــرم کـــەس ســـەری لیٚ دەرنــــەکا
بــــەڵکو ئــــەو ئاهۆیــــە هۆیــــەك بــــیٚ کــــەجاریٚ بیٚیــــە ســــویٚم

* * *

واش بفـــەرموی دێـــم بـــۆ قـــەتلت شـــەرتە هـــاتنت کـــەم ڕەچـــاو
فەرشـــی ڕێگــەت کــەم بــەنێرگز نەخشـــی خونچـــە وبـــۆن گـــوڵاو
بـــۆت لـــە پێـــش قـــاپی بـــەکڕنوش(پـــاکی) وەســـتیٚ پشـــت چـــەماو
شـــەرتە (هێـــدی) مـــــن ڕنـــوی بـــــەفران بم فرمێســـکی چـــاو
لایـــــە بـــــۆت بتوێمـــــەوە لایـــــە بـــــەرپێت هـــــەڵوەریٚم

پاکی

ڕەمەزان ١/ ١١/ ٢٠٠٢

## دەردی دووری

## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری ( حەقیقی )

جانە لافی بێ وەفایی و دڵ ڕەقی بووتان بەسە
ڕەش سووتانی دڵ بەخاڵی سەر گۆنای رووتان بەسە
چاری بۆ پیری لەشینی وەك منداڵ دووتان بەسە
دەردی دووری زۆر گرانەو دولبەرا هیجران بەسە
دڵ وەکو پەروانە سوتا چاوەکەم سووتان بەسە

* * *

ڕەوتی کۆتری و نازی شلکەی نێرگزینت بەو قەدە
زاهیدانی وەرگەڕان زۆرکرد دێوانەی ئەو قەدە
بۆم نەبووی توخوا نەیاریش گەر بەڕووها روومەدە
عاقڵان شەیدا دەبن ڕووبەندی سەر ڕوولامەدە
عاشقان کوشتەی جەفاتن قەتلی مەزلومان بەسە

* * *

دۆزەخیش کڵپەی بەتینی دووری تۆ سازە بەتاو
جا چی‌یە بۆ عەشقی پیرۆز وێڵی دوای خوێن کەم بەئاو
تانەڵێن چیتر لەمەولا مەم بەزین نەماوە باو
مورغی دڵ پابەندی دانەو داوی خاڵە و زولفی خاو
گیری بەندیخانە تاکەی بەندی بێ ئامان بەسە

کـــێ بـــوو نــــەگلا زەق بەتــــەوقی ســــەر لـــەداوی ڕاوەکــــەت
ئــای ســوپای دیــل کـــردوە جەیشـــی زولفـــی ڕەش لـــول دراوەکـــەت
تـــۆی کەســـەر لەشـــــکر عـــــەزیزم بـــــەردە دیـــل گیراوەکــــەت
هـــەرچی بــــووم بـــردی بـــەتالآن تورکـــی مەســـــتی چاوەکــــەت
تاقـــــەت و ســــــەبرو قـــــەرارم پــــێ نــــــەما تـــــالآن بەســــــە

* * *

کـــۆی نـــەبووی خـــەندێکی ڕووت بـــوو دێـــوەرە و ودینـــی و شــــڕیم
خۆشـــم حــــالّی نیـــم وونـــی کـــام شــــارو قــــاپیم ئـــەی پـــەریم
بۆیــــە حەقمــــە ڕق لـــەڕۆژگار ئــــەو لــــە ســــینەت دایـــــبڕیم
شـــاهیدم فرمێســــکی خوێنینـــــە کــــە تـــۆ جـــەرگت بڕیـــــم
عاشــــقی ڕووتم ئەگـــــەر تەقســــیرە گــــەر تــــاوان بەســـــە

* * *

زولفــــە قـــاریش نـــــەی بڕیـــــم وەك دیــــم لەبــــەر دەروازەدا
هەڵکــــەنم قــــەندیل بـــــەیادی نـــــاز نیگــــای ئــــەو نــــازەدا
پێـــم کەمــــە قــــەت وامەزانــــە لــــەو هەڵــــە دڵ بــــازدەدا
ئێســــتکەش مــــەجنون و لـــــەیلێ هــــــەن لەعـــــەصری تـــــازەدا
شـــێت و ســــەرگەردانی تـــۆم حـــەیرانی تـــــۆم حیرمــــان بەســــە

* * *

رۆح دەڵێن دژوارو سەختە دەرچێ وێردی سەردەمە
بەس دەدەم گیان هەر لەکاتێ لێو تۆراوی سەردەمە
یاکە ڕووی ماهی دەپۆشی شەو دەکا بەوپەرچەمە
گەنجی عەشقت پڕ بەوێرانەی دڵە و من پێم کەمە
تا زیاد بێ چاوەڕێی دیشم مەڵی ئیحسان بەسە

* * *

دۆزەخێکە ئەو ئەڤینە گەرچی بۆ دڵ لانەیە
بۆیە هەرچەند دوور بڕۆی دێم گەرچی پێت شێتانەیە
بۆ ژوانت دڵ بەقەقنەس فێرە لەم سووتانەیە
گەر قسەی عیشقی گوڵ و بولبول لەلات ئەفسانەیە
تۆ گوڵی خەندان و ئەمنیش بولبولی گریان بەسە

* * *

پۆخی تازەی چاوی هیوای دڵ بەخەم کۆتکراوەکەم
کوا بەهای هابێ بزەی تۆ خشڵ و کارگەی دراوەکەم
شەو دڵی (پاکی) چراکە ماهە ڕوو پۆشراوەکەم
ئاورت بەردا دڵ و گیانی (حەقیقی) چاوەکەم
دەردی بێ دەرمانە عەشقت دەردی بێ دەرمان بەسە

پاکی
١٢/١٢/٢٠٠٢

## وەسفی حاڵی نگبەت و بەد بەختی
## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری ( خادیم )

هـــەرچی دیتـــم هـــات بـــەدوما ڕاوی هـــەر بـــۆ عانەیـــە
دەســـتی فریـــاو یارمـــەتی کـــوا ڕاســـتی وەك ئەفســـانەیە
دۆســتی خــۆم گــەر وەك نــەیار بــێ ڕووی ڕەقیــب بــا هەرنەیــە
شـــوێنە ســـەیرانگای بـــەهارم ئـــەسڕۆ بەندیخانەیـــە
خـــواردنم نـــان وپیـــازە بەرگەکـــەم هـــی کانەیـــە

*   *   *

ڕووت و زەردو پێخـــواس و ڕایـــەخم بـــوو مەینـــەتی
زۆر گـــەڕام بـــۆ نـــانێ ســـوتاو دەشـــتی کۆیـــە و جافـــەتی
بـــۆم نـــەبوو ناچـــار خـــەمم خـــوارد وا زگیـــش بـــۆ شـــایەتی
شـــیرن و خۆشـــاوی جـــەژنم چایـــە یـــا ئـــاوی پـــەتی
چێشـــتە خۆشـــەی بەربـــەیانم نیســـکی دانـــە دانەیـــە

*   *   *

بگـــرێ دەســـتم تـــۆزێ خۆشـــی بـــۆ لـــە دۆســـتم بادەیـــە
کێـــوە ڕاکـــەم نەگبـــەتی بـــۆم پێـــش قـــەدەم ئامادەیـــە
ژووری پـــاك و گـــەرم و خۆشـــم ســـەرکۆلان و جادەیـــە
پـــێ لـــەناو زنجـــیرو کۆتـــا دەســـت و دەم گیرۆدەیـــە
دڵ لەگۆشـــەی مەینەتایـــە عـــابیدو دێوانەیـــە

پاکی

١٢ / ١٢ / ١٩٩٩

## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری ( دڵدار )

لام وابوو ئەو چەرخە تاسەر خاوەنی بڕوا ئەبێ
هەوڵی ناوێ ژیان بەتەقواو زیکرو نوێژ ئاوا ئەبێ
زام و خەستەش چاری ناوێ لێی گەڕێ خۆی چائەبێ
دڵ بەدوو ئەفسانە کەوت وای ئەزانی وا ئەبێ
ئیشی دونیا ڕەنجی پێ ناوێ بەخۆی کۆتا ئەبێ

* * *

زامی مەرهەم کا دەبا جا بۆهەڵەی خۆی چاوبدا
هێزی کۆکا بەرلە ئەسپی بۆ ڕزگاری تاوبدا
بیربکا هۆی چی بوو ڕیسوا وا لەعالەم ناوبدا
نەی دەزانی ئەو بەعارەق داری ئومێدی ئاوبدا
گەر بە خوێنی پەینی بکا جا سەمەر پەیدا ئەبێ

* * *

تێدەگەی کەی هەربەیەکبوون دەکرێ چاری دەردی تۆ
کۆی جیهانت گرت جیهانیش شاهیدە بۆ مەردی تۆ
ئەمڕۆ چۆن ڕازی لەگۆشەی مەینەتی ڕەنگ زەردی تۆ
لفچی نابێ بیزانی کەلاوی کوردی تۆ
هەر بەکۆشش دێتەبەر باغی ئەمەل پەیدا ئەبێ

* * *

قـــین و نـــاتۆرەی لـــە دڵتـــا بســــڕە بـــدڕە ئــــەو پــــەڕە
بـــن بـــڕی هیـــوای نـــەیار کــــە لادە پـــەردەی ئـــەو شـــەڕە
ڕووی بینـــای دوچـــاوی گرتـــووی بــــەس بـــەکوێری هەڵپــــەڕە
ئـــەی بـــــرا لادە لــــەفکری کـــــۆن و زوو ســـــا ڕاپـــــەڕە
کارەکـــەت چـــاك ڕێـــك بخــــە ڕەنجـــت هـــەبێ خـــۆی چـــا ئـــەبێ

* * *

کردتـــە بـــیردۆز یـــەك نـــەبونی هـــــەر لـــە ڕۆژی زووی بونــــەر
بـــۆ ئەمـــەش لەشـــکانە یاســـای پـــەرت بـــلاوی بـــێ شـــونەر
تـــاجی ســـەرکەوتن خەیاڵـــە ســـەرنەکەی گـــۆ بـــۆ گـــوزەر
طـــــالع و ئیقبالـــــە وەهمـــــی پایەبـــەندی بـــێ هونـــــەر
عـــەزمی مەردانـــەت ببـــێ هـــــەر چیـــت نیـــاز بـــێ وائـــەبێ

* * *

نـــەت گـــەرەك بـــێ چـــاوی ســـاقی و پیاڵـــە دەســـتی لابـــدە
ژێـــر تـــەم و هـــەوری نـــەزانی دەرچـــوو پەســـتی لابـــدە
بـــەس ســـەمای بـــەردۆڵی دوژمـــن گـــلاوە خواســـتی لابـــدە
مردنـــە ژینـــت بـــەبێ کـــاری لەســـستی لابـــدە
هـــەر بـــەرەنجی لاوی وەك تـــۆ نیشـــتمان ئـــاوا ئـــەبێ

**پاکی**

٢ / ٢ / ٢٠٠٢

## مەهابادی
## پێنج خشتەکی لە سەر شیعری عەونی حەبیب کۆیی

چـــی بـــەیان کـــەم بەســـەر هـــاتم بـــەدێڕێ پـــڕ لـــە نـــامورادی
گـــەلێ تـــاڵی و جـــەفام کێشـــابژیم ژینـــێ بـــەئازادی
بڕیـــم هـــەورازی زۆر ســـەخت و گـــەڕام تەکیـــەو بـــاڕو نـــادی
لەبـــەر جـــەوری کەســـێکی کۆیـــی بـــێزارم بـــووم بـــەبێ دادی
فەلـــەك خســـتمیە بەردەســـت چـــاو جوانێکـــی مـــهابادی

* * *

زۆر لـــە مێـــژ بـــوو بـــەهیوابوم چـــاوەڕێ بـــووم لـــە کوچـــەو ڕێ‌ی
هـەتا قوربـان بـوو قوربـان کـەم سـەرم بـۆ تـۆزی کەعبـەی پـێ‌ی
کـــەچی مـــەیلی نـــەبوو یـــارەب وتم خـــێربێ چ قـــەوما لێ‌ی
کـــەلێ‌ی دام غـــەمزێکی خســـتمی وەهـــام گـــوت پـــێ‌ی
کچـــێ ئافـــەرین بۆتـــۆ کـــە چـــالاکی لەســـەیادی

* * *

بـــەخۆڕایی نییـــە پەســـت و مـــەلول و مـــات و دامـــاوم
ڕەقیبێکـــە لـــە بـــۆ کوشـــتەی ســـەرم هـــەردەم دەکـــاڕاوم
بـــەلام شـــەکوا لـــە بۆکـــێ بـــەم لەبـــەختم کـــوا لێپســـراوم
گوتـــی هەرکـــەس کەکەوتـــە بـــەند و داوی پەرچـــەمی خـــاوم
مەحاڵـــە بـــەر بیـــێ نـــابێ بکـــا قـــەت بـــیری ئـــازادی

ئەگەر داخی نەبا جەستەی یەکم بۆ بوو. بە پیتی نوون
مەکەن لۆمەی تێنووی لێوم بۆ ماچی کوڵمی ئاڵی ڕوون
لەشۆخان ئاخ کەتێ ناگەم ئەگەر هەر خوا بزانێ کوون
لە کوردستان نەبو سیحرو تەلیسم و جادوو ئەفسوون
لەکوێ فێربووی شۆخی و دولبەری وا هێندە ئوستادی

* * *

لەبەد بەختی ئەوەی تالاو هەبوو لەو چەرخە ڕێك بردم
لە ژێر کۆڵی جەفای ئەودا سوتاوم رەش بەهەڵگوردم
ئەبێ پاداشتی ئەو شۆخە چ بێ لەدوای لەڕێی مردم
بەشێوەی شیرینی تەوقی ئەڤینی خۆی لەمل کردم
منیش وا لێ بڕاوم بێنمە دی ئاکاری فەرهادی

* * *

کەدەرکەوێ ڕووی ئەم شۆخە لە ڕووی مانگ ڕووی حەشاردایە
ئیلاهی سەد پەری قوربان لە جەننەت تۆ کەداتنایە
ئەگەرچی بۆ هەڵەش خەندەك لەڕووی نەم دی بێتە کایە
ئەمن مەجنونم و زنجیری ئەستۆم زولفی لەیلایە
ئەگەر مەیلی ببێ یاخۆ نەبێ من هەردەکەم یادی

* * *

لــــەداخی بـــێ وەفــــاو پـــاکی هــــەموو ســــاتێ دڵــــم تەنگــــە
نــــەبوو کەســـێ هــــەتاکو ســــەر، کەپشـــتم بـــێ لــــە ئــــەم جەنگــــە
نەکاشــین (پــاکی) ئــەی چبکــا وەکــــو خەســــتەی لەســــەر جێگــــە
لــــەدووری تۆیــــە کــــەوتووە (عــــەونی) وا چــاوەڕێ مەرگــــە
کەنــــەت بیســــــت چاوەکــــەم جــــاری چریکــــەو داد و فریــــادی

**پاکی**
٨/٨/ ٢٠٠٠

* * * * *

## شیعری ( پاکی )
## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری ( سالم )

ئێشـــی کوانـــێ خـــوێی بەســـەر زام قـــەت وەمـــا ناکولێتـــەوە
وەك بلێـــن شـــۆخ بـــاری کـــرد چـــوو مـــەیلی پێـــت نابێتـــەوە
دیـــارە دڵ کێـــوە لەمـــەودوا چـــۆن دەنـــا ناتوێتـــەوە؟
بـــەس نیـــە پەروانـــە وەك عاشـــق ئەبـــەد ناخولێتـــەوە
نیمـــە چەرخێکـــە دەســـوتێ وحالـــەتی دەبڕێتـــەوە

* * *

تاســـوڕی بـــێ ئـــەم زەمانـــە ونـــەمری خـــەزاڵ و ڵاس بـــدا
گـــەر بەقـــەد ئـــەلیاس بژیـــم وگیـــان لـــە لەشمانەفـــەس بـــدا
کـــۆی لەبـــەختم گـــەنجی جیـــهان خـــوا بـــە منـــی بـــێ کـــەس بـــدا
گـــەر لەحـــەوزی کەوســـەرا ئـــاوی حـــەیات بـــۆم دەس بـــدا
ژەهـــری مارێکـــە بـــەبێ تـــۆ قـــەت بـــەمن ناخورێتـــەوە

* * *

بتـــوێ لاشـــەم گـــەر لـــەرێتا خۆشـــە نـــاڵێم مـــانعم
ڕوو هـــەموو دەردێ بـــەڤینۆس وا لەشـــەوق و مـــالعم
نوقمـــی گـــەر دەریـــای خەمیشـــت دام خـــودا چـــەند قـــانعم
وەك یـــەهود دنیـــا گـــرێ دابـــێ وا لەبـــەختی طـــالعم
حـــەزرەتی ئیدریـــس بـــە نـــاخونی ســـەعی کـــا ناکرێتـــەوە

* * *

پڕلەسیحرو ئەفسوناوی گەرنەبا دووچاوی شین
چەندەها لاوچاك ودەستەی عاشقان مات و حەزین
قەت لەڕووت بێ هۆش دەکەوتنە هێزی بەر لافاوی شین؟
ڕۆژی ئەوەل ثبتی دلْ بوو حەرفی عیشقت بعدە زین
قەت بەسیلایی حوادث لای محو نابێتەوە

* * *

تاچرۆو، خونچەو، بەهارو، دۆڵ وتاڤگەد، و چیا هەیە
بولبول وگوڵ، کێو و کانی و، تا لوئلوئی دەریا هەیە
تاکو لە دڵی (پاکی) عەشق وسۆزو دەرد بریا هەیە
تا ڕەقیب بێت و بچێ لەوڕێیە تادونیا هەیە
دەرکی خەم بۆ سالی بێچارە داناخرێتەوە

پاکی
٢٠٠٤/١/١٥

* * * * *

## پێنج خشتەکی لەسەر شیعری سالم

دەبــێ ســەر قافڵــە بــێ عاشــق لــە مــەیدانی جــەفاو دەردی
ســەری گۆکا لــەدەم پــای ئــەو نەمامــەی هۆشــی ســاند بــردی
ئەمــە یاســای مەمــەم وزینــە و لــەولاش فــەرمووی وەهــا کــوردی
لــە یەکســەر بــێ محبــەت حــاصلی کــوا غــەیری دڵ بــەردی
دەبێ مەعشــوق وعاشــق هــەردوو وەك یــەك بــن لــە هــەم دەردی

* * *

هــەمووی مــەجنون نییــە و عاشــق ئــەوەی دێوانــە بــەو هــەردە
دەبــێ شــەوقی لــەمانگ بــبڕێ بــەڕووی کــێ عاشــقە بــەو دەردە
نــەبێ هیــوای بــە کۆشــك وپــول دەســتی خۆشــی لــەخۆی بــەردە
زەعیفــی و قوەتــی طاقــەت لەعیشــقا جەوهــەری فــەردە
لــەوێدا قوەتــی بــازوو عــەیان ناکــا جــوان مــەردی

* * *

لەگــەنجی زولفــی دووتــای تــۆ گــەدا مــاون شــاهانی تــۆ
دوبــارە شــەرمەزار بــوو گــوڵ لــە خــەندەی دەم بــەیانی تــۆ
دەخیــل ئــەوجارەت قــەت نــامرم لــە دەســت بگــرم دامــانی تــۆ
لــەدقت وعرفــی فیکــرم شــەل دەکــا وەســفی دەهــانی تــۆ
بــەبیری مایــەوەزیکری بــەمن نــەکرا لەنامــەردی

* * *

نکـوڵی ناسـکی حـۆری نیـم مەرجـە شـیرنی بـە تـۆ تیابـێ
بـەهای تۆکـوا وەکـو پێویسـت لـەڕووت یـاقوت بـێ بـەهابی
ئەگـەربێ هـۆش نـەبم شـەیدات دەبـێ لەوخەڵکـەدوور جیابـێ
بـەداماوی خـیرەد چـارەی عروسـی وەسـفی تـۆ نابـێ
لەپـەردەی دڵ معطـل مـا بـەباری شـەرم و ڕوو زەردی

* * *

خـودا عاشـق دەبـێ بۆچـی هێنـدە کوشـتەی ئـارەزوو بـێ
کێـوی پـیرس سـەنگی کوانـێ بـەتای خـەمم تـەرازوو بـێ
بەخـەندێ (پـاکی) سەربەخشـە دەڵـێ ئـەو بـارە بـازوو بـێ
لـەلای مـن غافلـە (سـالم) ئـەوەی فـەخری بـەبازوو بـێ
ئەگـەر مـەردە لـەڕێی عەشـقا بـدا لافـی جـوان مـە ردی

(پاکی)
١٥/٢/٢٠٠٤

## دڵی ساوام
## پێنج خشتەکی شیعری ( پاکی )

دڵــــی ســــاوام لــــەدو بـــــالآی وەکــــو ســــاوای لەشــــیر بڕایـــە
بــەڕوو شـــیۆەی وەهـــا دەگـــری بـــەبێ ئۆقـــرەو خـــەوی زڕایـــە
هەرچـــەند دەکـــەم پێـــم ژێـــر نـــابێ بەســـەر دولکـــەو بـــەلای لایـــە
ئەگـەر پیری موغـــان فـــەرمووی لـــە کـــۆن ئـــەو دەرسـەی پێـم دایـە
دڵـــی عاشـــق کـــە جۆشـــی گـــرت بەهەشـــتیش بـــێ هــــەر ســـوتایە

* * *

کـــێ بـــوو ئۆخـــەی کـــرد لـــە داوی هـــەر لـــە بۆســـات و دەمـــێ
نـــازی گیـــانی نیـــوە بـــردم زوڵفـــی دوو شـــەی کـــرد دەمـــێ
شـــینە شـــینێ دڵ دەگـــیڕی عـــودو نـــەی نـــەی کـــرد دەمـــێ
دیـــن نـــەبوو شـــێخ ئـــەی چبـــو شـــێخ دووره ڕووی حـــەی کـــرد دەمـــێ
ئـــەبێ ســـوژدەی بـــەرەو کێبـــێ دوور لـــە دونیـــای ئـــەو بالآیـــە

* * *

نـــەبو قوربـــان و قوربـــانی بـــەخۆڕا کـــردم ئـــەو شـــۆخە
بەهارێکـــەو نـــەمامی دڵ گـــەلآی زەرد بـــێ چـــرۆو پۆخـــە
دەســـوتێ کـــز چـــرای گیـــانم بـــەرەو گلکـــۆ لەســـەر ڕۆخـــە
نەســـوتاوم عەجـــەب مـــاوم ئـــەمن لـــەو بـــارو ئـــەو دۆخـــە
کـــە دڵ پـــارچێ خـــەڵوزەو ڕەش بەدانـــەی خـــاڵی گۆنایـــە

دەڵـــێی تۆفانەکـــەی نـــوح بـــوو نـــەبوو گـــوێ گـــرێ ســـەداو دادم
وەکـــو ئەنفالەکـــەی کـــورد بـــوو نـــەهات کـــەس بـــێ بـــەفریادم
لـــە ناســـۆری و ســـیابەختم کـــەبێ خۆشـــیم و نـــامورادم
ئەگـــەر میحرابـــی ئەبرۆکـــەی نـــەبا بـــۆ بـــووم لـــەپای خـــادم
ببینـــن بـــەندە چـــەند دیـــل و گـــەدا کـــەوتوی بەردەرگایـــە

* * *

دەکـــەی دەرمـــانی دڵ تۆکـــەی کـــەمن پـــیرو کـــە نـــەفتێکم؟
دڵۆپـــێ شـــەونمە گیـــانم کـــەوێ هـــەرماوە ڕەوتێکـــم
ســـەفەر بـــۆ چـــاڵی مەرگـــە کـــەی دەهـــێی تـــۆ دەگـــری دەســـتێکم
نانـــا مەیـــە بانـــە ســـوتیێ بەمەشـــخەڵی کڵپـــەی گڕێکـــم
چونکـــە لاشـــەی جەســـتەی ســـوتام پڕیشـــکی هـــەروەك کـــورە وایـــە

* * *

هـــەر موتوربـــەی برینـــە بـــەبرین لـــەنێو نـــەمامی جەســـتەی مـــن
لەنجـــەت شـــیعرەو عەشـــقە و ئـــاواز لـــە نێـــو گۆرانـــی و بەســـتەی مـــن
پـــەری ڕوخســـاری ســـەرکردەی لـــەنێو عاشـــقانی دەســـتەی مـــن
وشـــە یـــاقوت و دوڕ وایـــە بـــە وەصفـــی تـــۆ لەڕســـتەی مـــن
ببـــورە (پـــاکی) بـــەو شـــێوە لـــە شـــێوەت کـــورت ئەگـــەر دوایـــە

پاکی
١٩٩٧/٧/٧

## شۆخ و شیرنی کوردستانە
## پێنج خشتەکی شیعری ( پاکی )

شـــەوی شـــەق کـــرد بـــەدووچاوی هەڵیـــهێنا کەمەســـتانە
لەســـینەی دوو شـــەمامەیدا کـــەبۆنی بـــاغ و بێســـتانە
هـــەزار یوســـف بـــۆ قوربـــانی ئـــەمرکا گـــەر لەوەســـتانە
دەڵـــێی ڕۆژی تەوافـــە بـــۆی هـــەموو ڕوحیـــان لەدەســـتانە
ئەگـــەر حـــۆری و پـــەری بوبـــێ شـــۆخ و شـــیرنی کوردســـتانە

* * *

ئـەوەی دیـم هـەر لـە هـاوارەو لەدەسـت ئـەم چەرخـە بـێ دادە
لـە ژێـر کێـوی خەمـە هـەر دوو ئـەوەی پەسـتە وەیـا شـادە
دەسـا مـەیگێڕ دەخەسـت تێکـە هـەتا چـۆڕ مـاوە لـەم بـادە
زەمانێکـە وێڵـم بـەدوای، کـەچی ئـەو سـوارو مـن پیـادە
ئەگـەر کوشـتەی مـوژەی نـابم ئـەمن چیـم بـەو پـەریزادە

* * *

بەلەنجـە و ڕووی درەخشـانی دڵـی وەك گۆشـتە خـێر کـردم
وەکـو هـاڕوت کـەپێی دابـێ دەرس یەکسـەر دڵـی بـردم
ئـەویش زاڵ بـوو بـێ ڕەحمانـە بەسـەرما زانـی مـن کـوردم
حـەکیم کۆیـبێ بـە ئـەو حاڵـە چ نـاکرێ پـێی بـەڕووی زەردم
دیـارە دەردی عەشـق مەرگـە بۆیـە نـەی بـرد پـەی بـەدەردم

* * *

وەرە ئـــەی دڵ کـــەمێ دانیـــش لــــەپای چـــی وا کـــەبێ بــــاکی
لەمـــــەیدانی جـــــەفا تـــــۆ بــــوی کەسەرلەشـــــکر بـــــەچالاکی
وەکـــو شـــێواو دەمـــێ ڕوومـــەی دەمـــــێ دیـــارە لەســــــەرچاکی
کـــە ئـــەو ڕێگـــەی وەفـــای بـــەردا ئـــەتۆ : ئـــەمڕۆ بـــۆ غـــەمناکی
ئەگـــەر ئـــازار نـــەبێ مایـــەی چیــــە مایـــەی کـــە هیلاکـــی

* * *

هیـــوا زۆرە و تەمـــەن کورتـــــە لەســــەبریش کــــێ کـــە ئەیوبـــە
منیـــش عەشـــقم بـــەنازداری هـــەموو دونیـــا پـــێی مەعجوبـــە
ڕەقیـــب تـــا دانـــی پیانـــاوە دەڵــــێ: ئـــەم شـــۆخە مەحبوبـــە
لــــەچاو دەردم ســــەفایی بـــوو ئـــەوەی ڕابـــرد بـــە یەعقوبـــە
لەدەســـت حوکمـــی قـــەدەر چبکـــەم وەهـــا نووســـراوە مەکتوبـــە

* * *

هیـــوام ئـــەم شـــۆخە شـــۆخم بـــێ نەتـــەخت و تـــاجی هیـــچ شـــایێ
گەرەکمـــە یـــارو بـــاخ و مـــەی شـــەماڵێك و شـــنەی بـــایێ
هـــەیاس حـــەدی چیـــە وەك ئـــەو لــە ڕاوێـــژو وتـــەو ڕایـــێ
کـــەرەم کـــاپێم ئەگـــەر خـــەندەك هـــەمووی بۆتـــۆ حـــۆری دوایـــێ
دانـــەی ئـــەو خاڵــە بـــوو کوشـــتمی کــە پـــێی ســوتام لـــە دونیـــایێ

* * *

بــــەنوکی تــــیری دوو ئــــەبرۆی جــــەفای دام یــــار هــــەتا توانــــی
گــــەدای قــــاپی بــــەڕۆژ مــــن بــــووم بەشــــەو دەمکــــرد پاســــەوانی
کــــەچی نەیبەخشــــی پێــــم مــــاچێ بڵــــێ هــــەروەك زەکــــات هــــانی
موســــڵمانان ئــــەرێ یــــارم وەفــــای بــــۆچ بــــۆم نــــەما کوانــــی
وەکــــو بێژینــــگ کونــــە ســــینەی لــــە ســــینەی (پــــاکی) بڕوانــــی

**پاکی**

١٩٩٩/١٠/٩

## روو خۆشە

## چوار خشتەکی شیعری ( پاکی )

دەکـــا هـــاواری شـــەو ســـاقی دەڵـــێ پـــیری موغـــان بـــابێ
دەری والآیـــــە مەیخانـــــە نـــــەهاتووە تابـــــەیان بـــــابێ
باچریکـــەی ســـۆزی بولبـــول لەســـەر خونچـــەو گـــوڵان بـــابێ
کـــــەیار ئەمرۆکـــــە ڕوو خۆشـــــە شـــــیفای دەردی دڵان بـــابێ

* * *

ڕووی حـــەکیم و لوقمـــان بـــەچی، بـــەمن پەنجـــەی کەهەتوانـــە
دڵـــی عاشـــق کەجۆشـــی گـــرت چیـــە ناشـــیرینە یـــا جوانـــە
خـــودا ئـــەورۆژە کـــەی دێ بـــێ کـــە خـــۆی فـــەرمووی دێـــم بـــەو زوانـــە
حەشـــری قـــەتلی چـــاوی ڕەشـــی ئەگـــەر زۆر کـــردووە بـــەو دوانـــە

* * *

وتم بـــەو شـــۆخە لـــەو پیریـــە مەکـــە خـــەم هاوســـەرو جـــووتم
وەکـــو ســـاوامە شـــەیدا بـــۆ دەمـــی هـــەردوو مـــەمی ڕووتم
هـــەژارو برســـی ڕووی ڕووتم ببینـــە بـــێ نـــەواو ڕووتم
دەری قـــاپیم مەکـــە توخـــوا گـــەدای کۆنـــی دەســـتی زووتم

* * *

لەمەســـــتی چـــــاوی پێـــــم زاهیـــــد وەهـــــا کەوتۆتـــــە واوەیـــــلا
پـــەری فیردەوســـی کـــوا وەك ئـــەو ئەگـــەر ئـــەوبێ پـــەری ئیلـــلا
فریشـــــتەی ڕوح دڵـــــی بـــــردوم لـــــەوەتای یـــــار کەبێ‌مـــــەیلا
لـــەچاو عەشـــقم ئەفســـانە بـــوو ئـــەوەی مـــەجتون دی بـــۆ لـــەیلا

* * *

بـــەهیوای حـــۆری مـــام ســـۆفی دەبـــا هـــەر ڕیـــش بکـــا شـــانە
لەتەکیـــە زیکـــرو حـــەی بێـــتن لەگـــەڵ تەســـبێحی ســـەد دانـــە
لێی پـــیرۆز کـــۆی فریشـــتە و پـــەری جەننـــەت بـــەکۆو دانـــە
بـــەمن خـــەندێ بەســـە قوربـــان وەك تـــاپۆیێ ئـــەو جیهانـــە

* * *

دەنگـــی مەســـتان دێ لـــەدوور ڕا بـــە ئـــاوازی گۆرانـــی خـــۆش
دەڵێـــن (پـــاکی) وەرە تـــاوێ چ مـــەعلوم مـــای ســـبەینێ تـــۆش
ژیـــان هـــەندە تیـــا مەســـتی بـــا بەبـــەرتا نێتـــەوە هـــۆش
کـــوا خرۆشـــی بـــەهار وەکـــو ســـینەی عاشـــق دێنێتـــە جـــۆش

**پاکی**

١٩٩٩/١٠/٩

## چییە مانی
## چوار خشتەكی شیعری ( پاكی )

بـــەدەم ئێـــش و جـــــەفا و دەردا بمێنـــیٚ دلْ چییـــە مـــانی؟
لـــــەلایێ دەدزی دلْ لێـــــم و لـــــەلایێ پێـــــم دەلیٚ كـــــانی
وەكــو كێوێكــە ئــەم عەشـــقە نـــەزان بـــووم خســـتمە سەرشـــانی
بـــەچاوی تـــۆ قەســـــەم ڕوح دەم نـــــەماوە زۆر بەئاســـــانی

* * *

ســـەرە مەرگـــەو ڕوحیـــش نـــاچیٚ هیـــوای لێـــوری تۆیـــە دلْ
لـــەنێو زینـــدان و دلْ خۆشـــە بـــەهۆی ســـێبوری تۆیـــە دلْ
نـــەخۆش و زەردو كـــز بـــاوی هـــەمووی نـــاگوزوری تۆیـــە دلْ
پـــەری و حـــۆری لـــە ڕووی نـــاوێ هـــەتا لـــە حـــوزوری تۆیـــە دلْ

* * *

مەبـــە سەرســـام ئـــەوەی ڕووی دی لـــەڕووت لافـــاو بكـــا شـــینی
بەغـــــەمزێكت هـــــەمووی ڕازی دەدا مـــــالْ و ســـــەرو دینـــــی
جلّـــەوی بـــەختی شـــۆڕە ســـوار چـــاك گـــەر لەمـــەیدان خـــوار بـــو زینـــی
لـــەنێو كـــۆڕی عەشـــق ڕاكـــەم ئـــەوەم پێـــم شـــەرمە بم بینـــی

* * *

وەرە ڕوحم چی یە ڕوحم لەمەیدان بۆت کەسەر گۆیە
مەگەر هەرخوا بزانێ چەند دڵم پەیوەستی ڕووی تۆیە
دڵی لاوازم هەندماوە دەڵێی پۆخی دەمی چرۆیە
چی یە کوشتارو ئەو قەتلەی دەکەی خوڕا بەو دوو برۆیە

* * *

کەناخۆشی دڵی پۆشی بەچی مولکی تاپۆی چینم
نەبووم دیلی سوپایێ بووم بەدیل بۆ زولفی چین چینم
لە لەنجەو عیشوە وەك تاوس، لەنەغما چین و ماچینم
ئەگەر بای ئاشنام بۆچی بەڕووی ڕۆژگار دەچووقینم

* * *

نوشتەی سەفحەی دڵی تۆمە خەمت تالێ بڕەتێنم
وەکو وێڵی خدر بەدوات وونم لەکوێ ی لەوێ شوێنم
لەکۆی دەردت ئەگەر گرتم وونیش توخوا مەکە خوێنم
بەچاوی تۆ قەسەم جەژنە لە ڕوح زیاتر نەبووبێنم

* * *

سەما کەوتون هەموو مردوو لە عیشوەو نازو زەوقی تۆ
هەزار ماڕووت بە شاگردت لە فێڵی داوی مەشقی تۆ
چی یە خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆم کەم لە شەوقی تۆ
بەلای دونیای ڕەتاند (پاکی) لەمل هەرماوە تەوقی تۆ

پاکی
١/٦/٢٠٠٢

## چوار خشتەکی شیعری ( پاکی )

### خودا تاکەی

کەشەو بێدەنگ و کش ماتە بەهۆی ناڵەی حەزینم من
سکاڵاو دادو هاوارمە لەجیاتی پێکەنیم من
خودا تاکەی بەخۆڕایی لەناو داوو کەمینم من
کە زستان وشکە نواری بووی لەهاوین زۆر بوو شینم من

* * *

نەبوو دەستی قەدەر چی بوو کەنەیگرت خونچە گوڵزارم
یانە حوکمی زەمان وابوو لە گەرمی نەگبەت بازاڕم
هێندە زۆرە لەژێر گلکۆش لەمن قەت نابڕێ ئازارم
گەلێ مەمنونی ئەو چەرخەم کەمێ کەم کا گریەو زارم

* * *

بەمن دونیا بەلاو داوی بەداوی زولفی چین چینە
کەعاشق وێڵ و سەرگەردان بەزامی تازە و دێرینە
کەتۆش بەرزە دەنگی قاقات چ باکت جەرگی بەبرینە
گەدا پاشایە ئەو ساتەی تەواوەی خەیاڵە لەم ژینە

* * *

لەسەر سەفحەی پەڕەی ژینم خەریکی خەم چنینم من
بەدەم ژێربای جەفاو ئازار وەك نەمامی ژەنینم من
بەبێ هیوا لە گۆشەی خەم هەر لەشین و گرینم من
هەناسێ هەڵبکێشم شاد نییە ڕووی کۆی زەمینم من

* * *

لەنەپساوەی هێرشی ئازار بەڕووما دڵ کەبێ شک بوو
خەڵات و جەژنە پیرۆزیم بەگوڕ ئەسرین و ئەشك بوو
هەر لە ڕۆژی بوون مەینەتی لەناو گیانی من بەشەك بوو
بۆیە سەر سام مەبە لاشەم ئەگەر وەك پوشی زوو وشك بوو

پاکی
١٦/ ٣/ ١٩٩٩

## دووری

دووری وەك دەرد دوور بــــەدووری ، ڕەنگـــی گرتـــووە پێمـــەوە
بۆتـــە پـــەت زنجـــیر کەلەپچـــە ، هــــا بەدەســــت و پێمـــەوە

ئـــاخ و داوی تـــۆو زەمانـــە ، جـــەرگی ڕەش کـــردوم گوڵـــم
شـــاهیدم بـــۆت خوێنـــی ئاڵـــە ، ســـێ جەســـە دەرشـــێمەوە

بـــیر لـــەڕابردووی ژیـــان و ، ڕۆژی ســـەخت، و تـــاڵ دەکـــەم
ســـەیرە مـــاوم مـــن لـــەدووریت ، چـــۆن بـــەبێت دەخولێمـــەوە

هەســـت دەکـــەم وەك شـــەم کـــە کـــەم کـــەم ، پێکـــراوم وکـــەم دەکـــەم
بـــەفری ســـەر ســـوانەم لـــەدووریت ، تـــك بـــەتك ، دەتوێمـــەوە

بـــەزم و خۆشـــی و بـــادە نۆشـــی یـــادی تـــۆم بیریـــا نـــەبوو
دەردێ توشـــــم تاقیامـــــەت ، هـــــەر دەلێـــــم دەیلێمـــــەوە

ئاشـــقەکاری تـــۆ بـــوو کوشـــتمی ، تـــازە ڕابـــردم نـــەمام
کـــوا (عیســـا) دوعـــایێ ســـەرما ، کـــا بـــەهۆش خـــۆم بێمـــەوە

شـــەرحی حـــاڵی خـــۆم لـــەبۆ یـــار ، کـــاتێ کـــرد پێـــم پێکـــەنی
ئـــەو لـــەلای وا گیـــای بـــەهارم ، ســـاڵ بەســـاڵ دەڕوێمـــەوە

پاکی
٩/ ٩/ ١٩٨٩

# ئامۆژگاری

بەسە بۆ مرۆڤ خووڕەوشتی
گەر ئەم خالانەی هەبێ بەگشتی

دەروونی خاوێن سپی و بێ گەرد بێ
ژیرو چالاك و زۆر ئازاو مەرد بێ

بیرو باوەڕی بە هێز و پاك بێ
درۆزن نەبێ و كرداری چاك بێ

خۆ ڕەپێش نەكا لەبەردەم خەڵكی
نەزانی نەڵێ چەند هەبێ كەڵكی

باوەڕی یەك بێ نەوەك جۆراو جۆر
لەكارو پەیمان ڕاست بێ هەتا گۆڕ

ئیشی سوك نەكا باسەنگی هەبێ
داوێنی خاوێن بانەنگی نەبێ

ویژدانی هەبێ و نەك بەدگۆیی
بوختانێ نەكا ئەم هات ئەو ڕۆیی

بۆ بەرژەوەندی خۆی ئەتۆی نەوێ
بانەكا بەقسەی دەروون چی دەوێ

بــــــــۆ قـــــــازانجی خـــــــۆی بـــــــا نـــــــەڵێ وایـــــــە
زیـــــــان لـــــــەبۆ کۆمـــــــەڵ نەهێنتـــــــە کایـــــــە

ئیـــــــتر براگیـــــــان ئـــــــەم ڕەوشـــــــتانە
لەهـــــــەر کـــــــەس هـــــــەبێ خـــــــاوەن ئیمانـــــــە

پاکی
١٩٨٦/١/٢٤ کۆیە

ئـــەم پارچـــە شـــیعرە لەعـــەرەبی وەرم گێراوەتـــە ســـەر زمـــانی کـــوردی لـــە (زاهیر ملا حسین) وەرگیراوە کوڕی شاعیری ناودار (ســامی عــەودال) بــەهۆی بــەڕێز دلشــاد خەیات (لەپەخشانی **منفلوطی**)

ڕاوی ئەم کا خۆی لەئەم کا چەشنی گورگە بۆرە بێ
ڕێگرو دەست بڕ بەخۆی بێ گوێ نەدا وەك کۆرەبێ
کاتی بانگیش نوێژ بە ڕواڵەت زیکرەکەی وەك دۆرەبێ
ئەو بەهەشتەم ناوێ بەخوا گەر بەهەشت بەم جۆرەبێ

* * *

ئەی دڵ هەتا کەی ناگەڕێتەوە
ئاوڕێ بۆ دواوە قەت نادەیتەوە
وریابە ئەسپی خۆش ئەجەڵ لەدوات
لەخولە گەر سەدان پێچ بادەیتەوە

* * *

بگەرەو خڕکەوە بەس بەدوای ڕاکە
تاوێ بۆ پشوو ورد تەماشاکە
بەڕووتا کێڵی چەند میرو گەدا
سەریان باز دەدەی لەو کۆنە خاکە

* * *

ئایا بیر ناکەی کاتێ هاتی خۆت
پێخواس و برسی و ڕووت بە سەری کۆت
ئەمڕۆ لە سۆنگەی چی وەها گۆڕای
بە تەمای کە چووی چی بەی لەگەڵ خۆت

* * *

شـــــــەو كۆتـــــــا نـــــــەبێ ڕۆژت لێ نـــــــایێ
گـــــەندەتات نـــــاوێ تـــــا نەچێـــــە تـــــایێ
تۆچـــــــی لاواز و بـــــــێ هـــــــێزی ســـــــەیری
خۆشـــــــی و ناخۆشـــــیت بـــــەندە بـــــە بایـــــێ

* * *

بـــــۆ هـــــەوەس مـــــەیدە حوكمـــــی خۆڕایـــــی
تـــــا بـــــەرچاو نەكـــــەی ئـــــەنجامی دوایـــــی
ڕوو زەرد خـــــۆش نییـــــە بـــــەش لـــــە بەشـــــت بـــــێ
ڕیســـــوا بـــــە خـــــەڵك وتـــــەختی خودایـــــی

* * *

نەنوســـــتووم وریـــــام لەســـــەر ئـــــەم خاكـــــە
هەربســـــتێ هـــــەزار كاســـــە ســـــەرە لێی
بوركـــــانم لـــــە نێـــــو دەروونـــــی ڕەشـــــتا
هەرچـــــەند بـــــەهێزو هەرەشـــــە بـــــدوێی

* * *

قرچـــــەی جەســـــتەكەم كۆڵینـــــی چـــــاوم
یەكـــــەم هـــــەنگاوی ڕزگـــــار بوونمـــــە پـــــێی
كێـــــوە بـــــیروڕام دەریـــــام بـــــە ڕووتـــــا
تـــــۆ كـــــە خـــــوێی دەبـــــێ لـــــە نـــــاو مـــــا بتـــــوێی

چۆن لەگەڵ زەمان بژیم بەو جۆرە
کەشادیم نەبێ وخەمیش بەنۆرە
نازانم بۆ بووم وا بە حەماڵی
ئەو جەفاو جەورو نەگبەتە زۆرە

* * *

هەژاری بەندەم لە پۆلی دواوە
بەس لەگەڵ درکا گیانم ڕواوە
لەچی بترسێم بۆ ڕاستی نەڵێم
بەدۆلار خانووم خۆ سواغ نەداوە

* * *

هەرپول و کورسی ئەمڕۆ لە باوە
ماف و دادی چی کێ دەڵێ ڕاستە
ئەوەی چوو ڕۆیی داینێ بەو لاوە
کارو کرداریان وەك مووی ناو ماستە

* * *

ژیان بەم جۆرە رەنگە کە خۆش بێ
بێتو گەر سەری بەتاڵ وبۆش بێ
هەرچی تەواوە هەرناتەواوە
ئەو چەرخە سەختەی ئەگەر پێ خۆش بێ

ســـــــەیره لام دوژمـــــــن چونکـــــــه لای وایـــــــه
کـــــەمن ســـــەر ئـــــەبڕێم کـــــەس لـــــەدوام نایـــــه
بـــــەڵام ناکەســـــەی بـــــا بـــــاش بزانـــــێ
کـــــه دەورو پشـــــتم پـــــڕ ڕۆڵـــــه و برایـــــه

* * *

هـــــەر منـــــم وێڵـــــم بوویـــــه دیوانـــــه
هـــــەردەم میوانـــــی ئـــــەو یـــــاڵ و شـــــاخه
هـــــەروەك فـــــەرهادم ڕووم لـــــه کێوانـــــه
خـــــۆراك و خۆشـــــیم فرمێســـــك و ئاخـــــه

* * *

کوێربـــــێ ئـــــەو چـــــاوەی حـــــەز بـــــەکورد ناکـــــا
بـــــڕزێ ئـــــەو دڵـــــەی یـــــادی کـــــورد ناکـــــا
بـــــبڕێ ئـــــەو دەســـــتەی قەڵـــــەم بەپەنجـــــه
دەگـــــرێ و پـــــێی باســـــی مـــــافی کـــــورد ناکـــــا

* * *

ئـــــەڵێن خـــــەم مـــــەخۆ زۆر کـــــەس پێـــــم دەڵـــــێ
منیـــــش بـــــەناچار پـــــێی دەڵێـــــم بـــــەڵێ
باشـــــه کچـــــی کـــــورد گـــــەر پـــــەت لـــــەمل بـــــێ
(پـــــاکی) خـــــەم نـــــەخوا ئـــــەی بـــــۆ کـــــێ هـــــەڵێ

نەمدی مانگ بەڕۆژ کەس نرخی بگرێ
نەمدی بەمەردی هەموو کەس بمرێ
بەڵام من دیتم بە هەردوو چاوم
دایك و ڕۆڵەکەی پێکرا سەر ببڕێ

* * *

لەخۆم بێ باکم بەس خەمی وڵاتم
سەنگی باواجی و کێوی ئەڵوەندە
چیم دا لە پوول و کۆشك و قەڵاتم
دڵم بە کەپری هەواری بەندە

* * *

بێزار و پەستی ئەو دەور و چەرخەم
هەوری ڕەش ئاسۆی هیوای خنکانم
ڕووم لە هەرلاوە بێتو کە دەرخەم
دڵ دەسوتێ وەك شار و دێکانم

* * *

ئەنجامی هەڵەی دوێنێ بوو ئەمڕۆ
ماوین سەرگەردان مات و دەستخەڕۆ
ئەمڕۆش وەك دوێنێ هەڵ نەقۆزیەوە
بەیانیش ئەمڕۆت دەکەوتە ئەستۆ

بـــــۆ شــــــیرین دەبــــــوو لــــــەلام بــــــەهارێ
نەبایــــــە چلــــــەو رووی توشــــــی زســــــتان
گـــــەر وەتـــــەن نــــــەبا بـــــەخوێنی گیـــــانم
بــــۆ رووگـــــەم دەبـــــو خــــــاکی کوردســــتان

* * *

ڕۆژێ دێ نۆبـــــــەت هــــــــا کـــــــا لــــــــەبوارێ
وەك گــــــەلای پــــــایز دەکەویـــــــە خـــــــوارێ
سروشـــــــت وەهایـــــــە یاســــــــای لـــــــەبوونی
هــــەر کــــەس ژیرێکـــــە و هـــــەر یـــــەك بــــە بــــارێ

* * *

چــــل ملیـــــۆن نــــــەمام لەچــــــەرخی بیســـــــتەم
بێجـــــێ و نـــــــەوابێ تاکـــــــەی ژێـــــر ســـــــتەم
دوای هــــــەول و خـــــــەبات مایــــــەی مــــــەرگ بــــــێ
نـــــەبووە لــــــە عالــــــەم لــــــە یاســــــا و سیســــــتەم

* * *

هــــــــەر دەڕۆم ناگـــــــــەم تــــــــاکو رزگـــــــــار بم
لـــــە قـــــەومێ رۆژی لاشــــــەوە زەنــــــگ بــــــێ
چــــارە نـــــوس وایــــــە هــــــەر بـــــەردە بــــــاز بم
هــــــەتا میللــــــەتم رووی یــــــەك لەجــــــەنگ بــــــێ

خەڵکی مەست دەبێ بەشەڕاب و مەی
من نەبێ مەستی ئەو شاخ و دۆڵەم
ئەبێ رزگاریم رۆژێ بێ کەی
تاکەی رێبواری ئەم بارو کۆڵەم؟

* * *

وەك هەتیو گێژی نێو دەریای رەشم
بۆیە بێ جێگەو بێ پشت و پەنام
هۆی یەك نەبوونە وەکو گای بەشم
بۆیە لە کاروان دوا کەوتە هەر مام

* * *

لەهەموو یاساو دەورو رۆژگارێ
لەدوای جەنگ ئاشتی و خەڵات بەخشینە
بەڵام لەناو کورد باوە بە بارێ
یا جەستە سووتان یا هەڵواسینە

* * *

بەدەنگی سازو، عودو، کەمانیان
ناکەومە سەما نیە ئامانیان
رۆتە رەفتاریان چۆن بۆتاحەزان
بوینە پەرژین و، پشت و، تامانیان

* * *

ئـــــاخۆ خــــــەمی مــــــن هــــــەر خــــــەمێ نــــــەبوو
وەك گــــــــەڵای زەردی پــــــــایز پــــــــــڕژاوە
دادو شــــــــینی مــــــــن هــــــــەردەمێ نــــــــەبوو
خوێنـــــــــی ئـــــــــاڵی مــــــــن هــــــــەردەم رژاوە

* * *

چــــوو بــــــە کــــــام لاوە خوێنـــــــی ئــــــەم لاوە
کێیــــــــە لەمــــــــەیدان دەربــــــــڕی راســــــــتی
بووبــــــە دۆلار یــــــا کەوتــــــە ژێــــــر پــــــاوە ؟
کوردســـــــتان تاســــــەر کێبــــــوو پاراســــــــتی ؟

* * *

داخــــــــی رووی شــــــیوای ماتــــــــەمی کــــــــوردە
پــــــــایز لەشــــــــکری خــــــــەزانی کۆیــــــــــە
بۆیــــــە زســــــتانیش توشــــــــە لــــــــەم داخــــــــە
لافــــــــاوی بــــــــەگوڕی وەك تانجەڕۆیــــــــــــە

* * *

کــــــــەدیم کســــــــپەکی خســــــــتە هــــــــەناوم
تــــــیرێکی لێــــــدام وون بــــــوو لــــــە چــــــاوم
تــــــازە تــــــا مــــــــردن دەبــــــــێ بنــــــالّم
هــــــەروەکو دایکــــــی رۆڵــــــە کــــــوژراوم

خوایە بۆ جوانان هێندە لەباون
بۆ هێرش و پەلار بۆ هێند بە تاون؟
ناسک و دڵ شکێن وریاو بە هەستن
بۆ دیلی دڵان هەردەم لە ڕاون

* * *

بەلا بەلێشاو با سەربەخۆ بێ
ئازاریش چەند هەی یا لە دڵ کۆ بێ
ڕازیم بەمەرجێ بخشێنە چاوێ
دەرد لەمن غەمزەش بالەسەر تۆ بێ

* * *

ئەوا بۆم دانای موڵکی دونیایێ
بۆمنیش بستێ لەگۆشەی لایێ
وابەخشیم بە تۆ زێڕ و کارگەکەی
بۆ منیش خەندە و پێک و نیگایێ

* * *

توانج و تانەی ناحەزان کوا هێشتمی
دادو ناڵە وخەم جەفا بوو بێشتمی
تیرە غەمزەی چاوەکانی وەك نیشان
زۆر بەناهەق دای لە سینەم نێژتمی

* * *

خاڵەکەی ڕووی کاریٚ وای پێم کورد دەبێ
ڕۆژی حەشریش هەربڵێم ئەو کوشتمی
چاویٚ سەیری گۆشتە خێری جەستەکەم
نا رەوا یار هەر بەخۆڕا بەشتمی

* * *

دوور لە دڵداری هەردەم تاساوم
لەعشقی ئەڤین قەت نەترساوم
فەرهاد بە پیری و من سۆزی عەشقم
لەو شیرە بوو پیٚی پەروەردە کراوم

* * *

نەپولم دەویست نەشای سەرتەختی
ئەو دەردە چی بوو گرتم بەسەختی
چەند بیری وردی لیٚ دەکەم شك بەم
هیچ نیە تەنها کورد و بەدبەختی

* * *

ئازیزم یا خوا رەشی نەپۆشی
هەر شاد ودڵت پڕبی لەخۆشی
ئاواتە مەرگم بەلاٚم نەك ئەتۆ
چرکەیەك خەم وئازار بنۆشی

* * *

بـــــەم واتـــــە ســــاوا نیـــــم بخـــوێم تـــــەفرە
کەزســـــتان زریـــــان شـــــەختە بـــــاو بــــــەفرە
یــــــار لەگــــــەڵمابێ چـــــوار کـــــــژ بـــــــەهارە
بلێـــــم زســـــتان هـــــــەی درۆیـــــــە کفــــــرە

* * *

گـــەر دڵـــم دەشـــکێنی توخـــوا ســـەد تکامـــە هـــەر مەیـــە
خـوێم بەشـەم کـرد سـەیری رووم کـە تـوێش لـە راسـتی هـەر مەیـە
هـــەرچی هـــات وەك روژو، مـــانگ و، ســـاڵ، منـــی هـــەتوان نـــەکرد
بۆیـــە دەســـتم نـــا لەدەســـتی مـــەی بکـــا چـــار هـــەر مەیـــە

* * *

بەبـــــــــەختی ڕەش ئـــــــــەمن ڕازیـــــــــم
ئەگـــــــەر ڕەش بـــــــێ وەکـــــــو چـــــــاوی
ئـــــــەدی بۆچـــــــی دەڵێـــــــن شـــــــومە
کـــــــە بـــــــەختی ڕەش نییـــــــە بـــــــاوی

* * *

بـــــــەڕووی زەردیـــــــش ئـــــــەمن رازیـــــــم
کـــــــەزەرد بـــــــێ وەك قـــــــژی خـــــــاوی
چیـــــــم لـــــــە خـــــــەڵکی کـــــــەوا رووی زەرد
هـــــــەر بـــــــە خەســـــــتە دێ بـــــــەچاوی

* * *

کە گوێت بەناڵەم کاسە مەگرە لێم
یەکیان گرتەوە برینی کۆن و نوێم
خۆشە لە ڕێتا گەر وەك دڵۆپێ
یا پڕوشە بە بەفرێ ژێر پات بم بتوێم

* * *

بۆ داوای کوڵمی وەك چرام دەکرد
گەر شەوەزەنگم هاوسەر نەبایە؟
پیری موغان بۆ بەهاوڕێم دەبوو
کۆی مایەم دەرد و کەسەر نەبایە؟

* * *

لاپەڕەی ڕەشی بەختی کڵۆڵێم
کاتێ لەپرتاو کەهەڵدایەوە
نووسرابوو بینیم وەها کە نۆڕیم
شادی تیا نەبوو لەهیچ لایەوە

* * *

داوی گڵۆڵەی ڕەشی بەدبەختیم
هەرچەند ڕام کێشا هەرهات بەدووما
بوو بەسێبەری وەخت و ناوەختیم
تاوێ بوو بەدوام تاوێ بەڕووما

* * *

هەژاری بەندەم لە پۆلی دواوە
بەس لەگەڵ درکا گیانم ڕواوە
لەچی بترسێم بۆ ڕاستی نەڵێم
بەدۆلار خانووم خۆ سواغ نەداوە

* * *

هەرپول و کورسی ئەمڕۆ لە باوە
ماف و دادی چی کێ دەڵێ ڕاستە
ئەوەی چوو ڕۆیی دایەنێ بەولاوە
کاروکرداریان وەك مووی ناو ماستە

* * *

کێ هەبێ هۆشی بێزار لەژینە
هەریەك بەڕەنگێ پەیڕەوی دینە
سەیر سەیرتر لەمەش بڕوانی
کۆی بەکاری یەك لە پێکەنینە

* * *

چاپوك و ئازاو ژیرو جوان و مەرد
دیمەنی ڕازاو گوڵی سوورو زەرد
زۆر جارم بینی و ڕۆیی و هاتەوە
بەڵام هەر ماوە لەدڵ ئاخ و دەرد

ئەشکەنجەو ئازار مەترسی و تاری
خۆشی و ناخۆشی برسی و هەژاری
زۆر جارم بینی ڕۆیی و هاتەوە
بەلاّم قەت جاریٚ نەمدی رزگاری

* * *

هەتا ئەو چرکەی بەرەو نەمانم
من کوشتەو مردەی دەستی خزمانم
بۆیە بێگانەش هەروەك سەگی هار
پەلامار دەدەن بۆ قاچ و ڕانم

* * *

هەرچەن بەهێز بووی گشت دەم و کاتیٚ
وریابە ڕۆژگار دەستی نەتگاتیٚ
چونکە وەك یەکە بۆی هەبوو نەبوو
بۆ سەرت بای ڕەش ئەگەر هەڵکاتیٚ

* * *

ئەم بگەرەو بەردە ئەم هاتوو چۆیە
ئەم بخۆو بڕۆ ئەم هەشت و نۆیە
لەم کورتە ژینەی بۆ من و تۆیە
بۆ لەتیٚ نان و بۆ قومیٚ دۆیە

* * *

کــــە بـــــووت دڵســــــۆزێ تونـــــد بکــــــرە پشـــــتی
قـــــەد مـــــەیدە بـــــەرتوانج حـــــەوتی بـــــە هەشـــــتی
بـــــۆت نایەتـــــەوە کـــــوا یـــــەکێ وەك ئـــــەو
تـــــێ بگـــــا مـــــەرامت کـــــۆی وردو درشـــــتی

* * *

وردو ژیرنـــــەبێ لـــــەژیان و دەزگـــــای
دەروون نەخەیتـــــە بـــــەر قـــــاپی دادگـــــای
نوقمـــــی ژێـــــر کێـــــوی ئـــــازار دەبـــــێ وەك
رێبـــــوارێ پێخـــــواس درك بـــــێ رێگـــــای

* * *

ئاســـــۆی هـــــەموو کـــــەس هـــــەر ژێـــــر تـــــەم نیـــــە
هـــــەموو چەشـــــنی یـــــەك عەشـــــقی شـــــەم نیـــــە
یـــــەك لەســـــەیرانە و یـــــەك دەســـــت بـــــە ئـــــەژنۆ
بـــــەلام کـــــەس وەك خـــــۆم خواردنـــــی خـــــەم نیـــــە

* * *

هـــــەزار دار بـــــڕی هـــــەر ئەروێتـــــەوە
ســـــەد تـــــیر لـــــە گۆشـــــت دەی چـــــا دەبێتـــــەوە
پشـــــکۆی رق نـــــەبێ کـــــاتێ کەوتـــــە دڵ
بـــــەئاوی ســـــیروان ناکوژێتـــــەوە

* * *

قـــــەت نـــــەمدی کـــــەدار هـــــەموو بـــــەربگرێ
نـــــەمدی گیـــــان لەبـــــەر هـــــەتا ســـــەر نـــــەمرێ
نـــــەمدی خـــــاوەن مـــــاف کـــــۆی مـــــافی بـــــدرێ
نـــــەمدی هـــــەموو کـــــەس بەرگـــــەی دەرد بگـــــرێ

نــــــــەمدی دیـــــــل بەســـــــەر زۆردار ســـــــــەربخرێ
نـــــەمدی لــــه کــــاروان کـــه کــــەر پێـــش نـــــەخرێ
نـــــەمدی هــــــەموو کـــــەس فرمێســـــك بســــــڕێ
نـــــەمدی یەکســــــانی کـــــەس پـــــیێ دابـــــنرێ

* * *

ئاغــــــەو مــــــەلاو شـــــێخ هـــــەر ئـــــەهلی زەوقـــــــه
هــــــەر وەکـــــو چـــــرا هــــــەردەم بـــــه شــــــەوقه
ئـــــــەوەش بزانــــــــه لـــــــــه ڕۆژی دوایـــــــــــی
قــــــاچی تــــــاملی زنجــــــــیرو تەوقــــــــه

* * *

ئەگـــــەر لــــــه ئاسمــــــان بێتــــــه خــــــوار بـــــــەردێ
تــــــاوانی زۆردار یــــــــا دەســـــــــتی ڕەشـــــــــه
لــــــەو چرکـــــــەی گیـــــانی مــــــەردێ کــــــه دەردێ
بۆنــــــــی هـــــــەزاران خونچـــــــەی چـــــــاو گەشـــــــه

* * *

ئــــــەبێ بــــــۆ مێــــــژوو باســــــی دێریــــــن کـــــــەی
ئــــــەبێ بــــــۆ فــــــەرهاد باســــــی شــــــیرین کـــــــەی
ئــــــەبێ بــــــۆ جەســــــتەی پــــــڕ زامــــــی بەســــــۆ
باســــــی هــــــەتوان و مەرهــــــەمی بریــــــن کـــــــەی

* * *

دۆســــت و ئـــازیزم گـــەلێ بـــوو هــــەردەمێ لام مایـــەوە
کـاری سـاز بـوو دیـم کـە ڕای کـرد لێـم بـە هــەردوو پایـــەوە
بـەس ئـەوەی بـۆ گیـان و ئێسـك و جەسـتەکەم هــەر بــووی وەفــا
خــەم بــوو تاســەر هــەر لەگــەڵما کەوتــە خوێــن ســـوڕایەوە

* * *

بـــەر لـــەوەی کـــە خـــۆم بکـــەم پێناســـــم
زۆر لـــە خـــۆم باشـــتر ئـــەوان دەناســـم
بـــەلاّم ئـــاخ چ بکـــەم ئابــــەم دودێـــــڕە
چـــی هــــەڵ بڕێـــژم مـــن وتــــە و باســـم

* * *

هـــەرچی پێــم دەڵێــن مـــن هـــەر ئـــەو کەســـەم
ڕەش بم یاســـی لەســـەر ئـــەو قســـەم
ئەگـــەر وەك قـــازی بێـــن هـــەڵم واســـن
پولـــەکین ئـــەیلێم تـــادوا هەناســـەم

* * *

دوورن لەڕاســـتی نوقمـــی چەوتینـــە
لەبـــەد بـــەختی کـــورد وا هـــەڵ کەوتینـــە
هـــەتا ســـەر لەشـــکر ڕووی لەهـــەڵدێربێ
مـــن و تـــۆ ســـەرمان لەبـــەرد چەقینـــە

* * *

ڕاست بۆوە نەبوو ڕاستی ژێر پێ یان
بێ لە فێڵ و درۆ چم نەدی، پێ یان
نەبووە بۆ هەزار جەستە بە شەم کەن
ڕێبوار نەیگرتووە سوارچی بە پێ یان

* * *

دڵ بەهیچ لەت لەت نەبو لەتی ناوخۆ نەبێ
دورە ئالأی کورد ببینم تاهەموو هێز کۆنەبێ
کوشتمی ئاخ خۆپەرستی و بەرژەوەندی تایبەتی
یەککرن کەی یەك دەبن ، ئاخر ئەگەر ئەمڕۆ نەبێ!

* * *

با وەك بەهەشت بێ ئەم جیهانەی تۆ
با ڕۆژ و شەو بێ دەست لە ملانەی تۆ
کۆڵی ئازار و خەمم بە تۆ چی
بەمن چی ئێش و دەرد و ژانی تۆ

* * *

قوربان کە سەرم من لە ژێر پێتە
چ حاجە دەڕۆی بەسەر خاکەوە
بەس وانێنەگەی ئەو دڵمەم شێتە
هەزار وەستاوە بەدڵی پاکەوە

* * *

له شوێنێ سەرم هەڵدا وەك برِكه
خۆشیم نەدی تا گەیمە ئەمرِۆكه
چی ئارەزووم بوو نەبوو سەرباری
ئەوەش هەردەڵێن وس بە خۆ كرِكه

* * *

پێم دەڵێن بەخشە دەوری پول مەده
كەچی نایدا خۆی بە برنج ساواری
پێم دەڵێ بە دوای مەیدا خول مەده
مەیخانەش بۆتە بارگەو هەواری

* * *

وەها تووش داوێ هاتووە بەسەرما
بەم حاڵە سەرسورِماوە چۆن سەرما
سەرمە وەك داری پایز رِووتاوه
بەرگەی ما كوانێ بۆ گەرما و سەرما

* * *

وریابە هەڵە زۆر تاڵە بەری
نابێ وەك مردووش شین كەی لەسەری
نەبووە بێ هەڵەش گرنگە بەس لەرِێ
بچیە ژێر داری هیوا و سێبەری

* * *

ئەوا بۆم دانای موڵکی دونیایێ
بۆمنیش بستێ لەگۆشەی لایێ
وابەخشیم بە تۆ زێڕ و کارگەکەی
بۆ منیش خەندە و پێک و نیگایێ

* * *

بەس هاتووچۆکە ئەم سەر و ئەو سەر
تاکەی بەس دەبیە عەمباری کەسەر
تاوێ بڕوانە کێڵی ئەم و ئەو
هۆلاکۆ و زوحاک قارون و قەیسەر

* * *

خۆشە لە دونیا ئەو دەم کە مەستی
مایەی ژان نەبێ چییە لە هەستی
لە ڕۆژگار گەڕێ ئازادە بۆ خۆی
زانابی ناکەی قەت بەرهەڵستی

* * *

من سەرهەڵگرتووی جیهانێکی وام
بۆ ئاهو ناڵەم کەسێ گوێ ناگری
یوسفی چاڵ و ڕاست و ماف ڕەوام
کەچی بۆ فریام کەسێ ڕێ ناگری

* * *

بۆکـــــام دڵســــــــۆزێ دەربــــــــڕم هەســـــــتم
بۆیـــــە لـــــە چاومـــــا دێ ئەســــرین بـــــە خـــــوڕ
دوێنــــــێ کـــــە ڕۆیــــــی بـــــۆ ئـــــەمڕۆ پەســـــتم
شـــــین وگریانمـــــــە بـــــــۆ بابـــــــە گوڕگـــــــوڕ

* * *

تـــــۆ هەڵـــــەت نـــــەبوو مـــــن بـــــۆ دژی تـــــۆم
مـــــن بۆخـــــۆم تـــــیرم دا لـــــە ســـــینگی خـــــۆم
ئاوێنـــــــە و گـــــــۆزە و دڵ شـــــــکا تـــــــازە
ناگەڕێتـــــــەوە هـــــــەروەك پاشـــــــای ڕۆم

* * *

پـــــێی بێمەکەنـــــە گـــــەر یـــــەك بـــــەبارێ
قـــــاچێکی شـــــکا بـــــەهۆی پـــــەلارێ
دوور نییـــــە کـــــە تـــــۆ دوو قـــــاچ و دەســـــتت
پێکـــــەوە بشـــــکێ و بکەویـــــ، خـــــوارێ

* * *

بـــــەش بـــــەحاڵم خـــــەم مـــــیراتی باوکـــــە
تۆقێکـــــە لـــــە ملـــــم هـــــەروەك ملوانکـــــە
ســـــاتێ لێی وون بم دوام دەگـــــەڕێ وەك
مـــــامری هێلکەکـــــەر وون بکـــــا ڕاوکـــــە

* * *

هێستر هەرچەندە گەورە و بەهێز بێ
هەردەم بەرەڵاو لەناو پەریز بێ
زۆر باش بزانە هەر کوڕی کەرە
ئەگەر بشفڕێ و بەنرخ و ڕێز بێ

* * *

هەتا من دیلی دەست براکەم بم
هەر دەبێ هیچ و بێ پایە و کەم بم
سواڵ کەری قاپی هەر ڕۆژەی شارێ
بۆ بەردەم شەوی ناکەس بەشەم بم

* * *

چیە هەر ڕاکەی ژیانی بێ کۆتا
وەك کەلەشێری خوڵ کەی بەخۆتا
ئاکامی چی یە لەدوای هیلاك بون
تێ ناگەی ژێر گڵ نەکەوی تۆ تا

* * *

خۆ نەناس هەردەم وڕێنە دەکا
زستان لەبەهار دروێنە دەکا
یەکێ نەیناسێ لە کۆڕو مەجلیس
(وەك) شا حوکم ڕای ئەو شوێنە دەکا

* * *

ئەی دڵ هەتاکەی ناگەڕێتەوە
ئاوڕێ بۆ دواوە قەت نادەیتەوە
وریابە ئەسپی خۆش ئەجەل لەدوات
لەخولە گەر سەدان پێچ بادەیتەوە

* * *

یەك چاوت دوو ئەبرۆت سێ دڵی من
کامیان ڕەشترە توخوا گوڵی من
چوار لێوت پێنج کوڵمەت شەش فرمێسکم
کامیان سورترە توخوا گوڵی من

* * *

حەوتەم پەرچەمت هەشتەم هۆشی من
کام شێواوترە توخوا گوڵی من
نۆ تام بۆنت دە سەیری بەهەشت
کامیان خۆشترە توخوا گوڵی من

* * *

تۆ کوشتەو شوشتەو نشتە بناسە
سپڵەو بێ وەفا دەمی وەك داسە
هیچە لە ڕەوشت قەت بیری دوێنێ
ناکا کە ئەمڕۆ لەدەستی کاسە

* * *

ئاواتە خواز بووم قەت پیری نەبا
چونکە لاوێنیم لێ بەدزی دەبا
بەهاری ژیانم بە پایز دەکا
خەرمانی عومرم دەداتە بەربا

* * *

تاسەر لەڕەگەز نابێ خانەدان
لەمەرد زۆر دەبێ ناکەس و نادان
گێتی کە ڕۆڵەی ڕسکاند شین دەبێ
نەتدیوە دەردێ گوڵ لەبن بەردان

* * *

یەك شێر دەردەچێ و چیا دەهەژێنێ
ئەم حەیای قەترێ ئاوە دەڕژێنێ
ئەم ژیانی مەردی و ئەو سوکو ڕیسوا
خاك تۆی سروشتە هەر:وو دەڕوێنێ

* * *

گیان لەسەر دەستی بێ وەفا دانێ
هێشتا پێت دەڵێ چیت کردووە کوانێ
خۆزگە تێ دەگا ورد ژیرو جوانێ
زوو لە گەنجی نەك پیر بوو بڕوانێ

* * *

خۆزگە تەمەنیش دەگەڕایەوە
وەك بەهار ساڵێ دەسووڕایەوە
لە پیری بەرەو گەنج و لاوێتی
تاڵی بەشیرنی تا بدایەوە

* * *

تا هەڵەی کرد بووی نەی دەکردەوە
سینگی بۆ خۆشی هەر دەکردەوە
ژیانی سەراپا کامەران دەکرد
گرەوی لەبەختی ژیان دەبردەوە

* * *

سەیرە لەکۆی لا بارانی مەرگە
هەر زامی دڵەو هەرداغی جەرگە
گوایە بە یاسای یەکسانی دەژین
لەکۆی یەکسانیش داخراوە دەرگە

* * *

نامەوێ سەر زار هیچ پێکەنینێ
تاڵەدڵ نەسڕێ کۆی یاخ و قینێ
ئەگەر وانەبێ وام دێنتە بەرچاو
مردیشم بەدرۆ بۆم دەکا شینێ

* * *

خوایە ئەم قینە چیە لە دڵدا
وەك خارو دڕكی پێوە بەگوڵدا
تەوژمی یاخی بۆ ناچێ هەتا
نەچێ بەناخی باوەشی گڵدا

* * *

لەوەتای بیرمە لە هاتوو چوومە
چیمان بەچی کرد لەو چەرخە شوومە؟
بای قەدەر نەیسە هەر چۆن بێ ڕازیم
هێرشی نەگبەتی بۆ وا لە دوومە؟

* * *

دوور لە دڵداری هەردەم تاساوم
لەعشقی ئەڤین قەت نەترساوم
فەرهاد بە پیری و من سۆزی عەشقم
لەو شیرە بوو پێی پەروەردە کراوم

* * *

نەپولم دەویست نەشای سەرتەختی
ئەو دەردە چی بوو گرتم بەسەختی
چەند بیری وردی لێ دەکەم شك بەم
هیچ نیە تەنها کورد و بەدبەختی

خۆزگە لەکاتی بوونا وەك مەرگ
لاپەڕەی مێژووی کۆی بەسەر هاتم
دەیاندامە دەست روانیبام هەتا
خۆشیەکەی چەندە وچەندە نەهاتم

* * *

بۆ ئەوەی حاڵی لەو مامەڵە بنام
پەژارەو خۆشی وسەختی وخەلاتم
خۆگەر بەزیانم هەمووی تەواوبێ
دیارە بۆ گاڵتەو مەینەتە هاتم

* * *

شەقاوی دوێنێت چونکە خوار رێ کرد
ئەمرۆکە قاچت لەداوا ئالاّ
پێش برکەی رێگای راستی خۆت نەکرد
زەقاو زەق بۆیە کەوتی بەچالاّ

* * *

ئاخۆ قەت دەبێ رۆژێ رزگاربم
لەگێژە لوکەی خەمی دونیایێ
کوا دەستی چاپوك فرێم دلتە ناو
کەشتیەکەی (چل ) شەو نوح لەدەریایێ

* * *

دڵنیام لەوەی بێ شك دەزانم
بەم هاوارەما هیچ کەسێ نایێ
وەك پەلە هەوری رەش لەکونجێکا
کەبێ رام ماڵی هەر مەرگی بایێ

* * *

لەداخی دوری ولەشکری حەسرەت
لەگۆمی زوخاو دڵ دەخواتەوە
بۆیە رووی وشکی پایزی ماتم
هەر بەگوڕ ئەسرین خاك دەشواتەوە

* * *

کەتۆ لەزاما دوری تێ ناگەی
چۆن مردوی دوێنێ بۆ بدوێنمەوە؟
چۆنت حاڵی کەم لەدونیای حەسرەت
بەهار لەزستان چۆن بڕوێنمەوە ؟

* * *

حوکم رای کوێریم پێ مەفەرموو تۆ
گوایە سەردولکەت بۆ دەخوێنمەوە
بەهاری عەشق وخۆشیم دزراوە
لەبری مەینەتی چۆتەخوێنمەوە

* * *

دڵ پــــــــارچێ لەگۆشـــــــت خــــــەم و ئـــــــازاریش
بــــــەدوام لەشـــــــکری کـــــــۆچ رەوی بـــــــازە
بـــێ قــــاپی مـــــەرگ دڵ بــــەچی خــــۆش کــــەم
کـــــــەهیوا رووخـــــــا هەرمەرگــــــــە تــــــازە

* * *

لەشـــــــێوای رووەمـــــــا دیـــــــارە کـــــــە مەرگـــــــە
بۆیـــــە پێـــــم ســــــەختە دڵ ئۆقـــــــرە بگـــــــرێ
دارە رەگ وشــــــکی ســـــــەد جەرگـــــــەی بــــــەهار
چـــــۆن پــــۆخ دەردەکـــــاو کــــەی ســــەوز دەگـــــرێ

* * *

زام و بریـــــــــــن و ژان بۆتـــــــــــە ســـــــــــەرمایەو
ســــــەر لوتکـــــەی خۆشـــــی ژیـــــانی بـــــەختیاریم
ئـــــاخ وحەســـــــــرەت و دوکـــــــەڵی ئـــــــاهم
لەچـــــەژنا بویتــــــە شـــــا گوڵـــــــی دیــــــاریم

* * *

هـــــــەر منـــــــم وێڵـــــــم بوویــــــە دیوانـــــــــە
هــــــەردەم میوانـــــــی ئــــــەو یــــــاڵ و شــــــاخە
هـــــــەروەك فــــــــەرهادم ڕووم لـــــــە کێوانــــــــە
خـــــــۆراك و خۆشـــــــیم فرمێســـــــکو ئاخـــــــە

* * *

لەمات و لولی خونچە کوڵ نادا
نابینی شانی قەد بە گوڵ نادا
لەدەمی تەنگت شەرمەکا بەخوا
نابتە گوڵ بۆیە زووسەر هەڵ نادا

* * *

قەت بۆ کەس نازیم چونکە من بۆ خۆم
کۆڵ کێشی بارو دەردی خەمی خۆم
باوەڕ بەکێ کەم چەند گەڕام نەم دی
دەست هەتوانێ بێ چاتر بێ لە خۆم

* * *

کاکە بۆهەندێ لەسەردار قەت مەڵێ راستەو بەڵێ
کەی ووتی بۆتۆمە بەخوا، خوا یەکە هێشتا هەڵێ
خوێن رژان و، ماف و، راستی و، سەربەخۆیی، هیچە لای
قیبلەکەی گیرفانی راست و چەوتە ئەو هەر بەم دەڵێ

* * *

شەڕابە کۆتەت کاتێ دەست دایێ
بەهەست و وریای زۆر لە دونیایێ
ژیان هەرئەوەندە تیا کە دڵ خۆشی
شا بەندە و بەندەش دەبێ بە شایێ

* * *

خۆشە یادی رابردو تاڵی بێ یا شیرینی
رۆژو ساڵ دێ بەسەرتا دەڕوا ئەمەش دەبینی
گرنگ دڵسۆز و، وەفا و، راستی‌یە هەرسێ بەڕاست
تۆی لە ریشەی جەستەدا زۆر بەپاكی بچێنی

* * *

ساوا بووم خەمیان دا لە پای شیرم
بۆیە لە رۆژگار من بێ تاوانم
ژێر چەپۆی زوڵ و، ناپاك و میرم
بۆیە لەڕاكەی دەست و دامانم

* * *

گەر كەسێ تەواو بەهۆش و ژیربێ
بۆچی حەزناكا شادی میوان بێ
بەس دڵێ زامی سەد نوكی، تیر بێ
ئەبی دێوانەی دەشت و كێوان بێ

* * *

هەرچی ئەم دیوولەم چەرخە كوتە
ئەمرۆ لە بەختی رەشم میوانە
شادی ناچێژم تازە لێم روتە
خۆر كەئاوا بووبانگی شێوانە

* * *

سەختی ژیان نەبا بۆچی ئازارم
لەباوەش دەگرت وەك كۆرپەی شیرین
فەرهاد لەکێوا خۆی دەکوشت ئەگەر
عەشق و شێت نەبا بە چاوی شیرین ؟

* * *

هەر دوێنێ وئەمڕۆ نەبوو بەشی تاڵ
سەرانسەر ژیانی داگیر کردوە
بڕوانە چاوی نەمامی جەستەم
بەخەم لق و پۆی چەند دەرکردووە ؟

* * *

ژیان لەبوون مەیە کە تا مەست نەبی
دیارە هەرلەبوون تۆتاتەواوی
ئەم دەنا چیتدا لەشەڕاب و مەی؟
نایگری لەدەست ئەگەر تەواوی

* * *

رامێنە لە وشەم وەها تێ مەگە
ئەو بیرو هۆشەم وڕێنە دەکا
نەخێر بۆ وشەی وشکی دەم پایز
دەم داسی تیژم دروێنە دەکا

* * *

ئای خۆزگە منیش فرمێسکی شادیم
قەت لەسەر رووما نەدەسڕایەوە
شەپۆلی خۆشی دەریای دوو چاوم
وەك كاروان سەرا نە دەبڕایەوە

* * *

داخی پێی داغم کە خۆم چرا کرد
کەسیش لە دەورم نەگیرسایەوە
حالی لەلاشەی شەمم نەبوو کەس
جەستەش وەك بەفری ژێر خۆر توایەوە

* * *

لەشێواوی رووم دیارە کە مەرگە
بۆیە زۆر سەختە دڵ ئۆقرە بگرێ
دارە رەگ وشکی سەد جەرگەی بەهار
نە پۆخ دەردەکا و نە سەوز دەگرێ

* * *

ئای خۆزگە وەفاش وەکو بای مەرگ
لەکونجی هەموو دڵێ شین بایە
نەك پیاوی دڵسۆز ، پاك و بەوەفا
بۆی لەدادو رۆو گەرمە شین بایە

* * *

باوەڕت هەبێ شەقی زەمانە
زۆر گێرەو کێشەت لەژیان پێ دەکا
زۆر جاریش هەیە لە ڕۆژا وەك شەو
پێت شەم و، لالەو، چرا پێ دەکا

* * *

چونکە دیم لەناو ئاوزنگی ئازار
بەم لاو، بەولادا زۆر دەخولایەوە
وەك شەم بوو لایێ و، پەروانە لایێ
تاوتاو دەسوتاو، تاو دەتوایەوە

* * *

بۆزەردە خەنەی سەر لێوی خۆی بوو
ئەوەی جارجاریش دەچووە لایەوە
خۆ کە تاوتاویش فرمێسکی دەڕشت
کۆتە برینی خۆی پێ دەکولایەوە

* * *

ئەم دڵە وشکەم بەهاری وشکەو
لەژێر تەزرەی خەم وشك بۆتەوە
بۆتە عەمباری کۆی جەفاو کەسەر
بەخەم لەشادی گرۆی بردۆتەوە

* * *

لەوەتای هەمە وادێ بەگوێما
خۆشی بە ئارام دێتە رێتەوە
هەر چاوەڕێمەو ، ونەو هەر نەهات
مەرگیش لە دەورم وا دەخولێتەوە

* * *

هەرچەند بەیانی رۆژانی زوو کەم
زیاتر برینم پێی دەکولێتەوە
چاکە بەناڵەی ئەمڕۆوە بناڵم
شیرن و ، تاڵی چوو کێ پێی دێتەوە

* * *

دەڵێن گریان و ، قوڵپی هەنیسك
سوکی ئازار و ، دەردی سەر دەکا
لە بەختم بە من چەند بەکوڵ بگریم
زیاتر چەکەرەی زام سەر دەردەکا

* * *

تاکەی لە قوڕگی بێوەفاو زوڵاڵ
بخنکێ هیواو ، ئارەزوو ، سۆزم
تاکەی لە رێچکەی بناغەی راستی
چەوتی رێڕەوی یاساو بیردۆزم

* * *

کوا خاڵی خەندەت بخاتە سەر لێو
بۆیە پێم سەیرە خۆش و رووئاڵی
شادی نازانی یا لە خەم ناگەی
یا هەست پێناکەی بە شیرن و تاڵی

* * *

یا کە دروست بووی ئەو دڵە گەورەت
رەقی بەکێوە ئاسن و پۆلایە
بۆیە وا دووری هەموو ساتێ لە
پرپشکی بارینی ژێر ئەو بەلایە

* * *

قەت وەها نابێ بەقوربان بێ وەفایی ودڵ رەقی
بۆ کفر بوو خۆشەویستی تۆ لە نێو دڵدا چەقی
خوێن و گیانم پێشکەشت بێ قبلەکەم هەردوو بەجووت
باشە بۆ پاکی لە دوولا هەر بۆ لایەك کوا حەقی

﴿ پێرست ﴾

# (( هەڵەکان ))

| ژمارەی لاپەرە | ژمـــارەی دێر | هــــــــــەڵە | راســـــــــتت |
|---|---|---|---|
| ١٨ | ١٥ | چرای | چراو |
| ٥٥ | ١ | بۆ | ئەم ( بۆ ) یەزیادە |
| ٥٧ | ٣ | له خۆین | لەخوێن |
| ٩٣ | ٢ | ولاتی و | وولاَت و |
| ١٢٣ | ٧ | له ڕۆی | له رۆژی |
| ١٦٧ | ٢ | تار | ناو |
| ٢٠٥ | ٦ | سینا | سینه |
| ٢٢٠ | ٦ | چۆی | چاوێ |
| ٢٢١ | ٣ | هەروەکو | هەروەك |
| ٢٤١ | ٧ | قاپیم ئەی | قاپی کوێ |
| ٢٤٤ | ١٤ | لفچی | لفظي |
| ٢٤٦ | ١٥ | کچێ | کچی کورد |
| ٢٤٩ | ١ | وەما | وەها |
| ٢٦٢ | ١ | بێ دەنگ و | بێ دەنگ |
| ٢٦٢ | ١ | کش | کش و |
| ٢٦٢ | ١٥ | خەیالنه | خەیاڵته |
| ٢٨٦ | ١٥ | نێنەگەی | تێنەگەی |
| ٢٨٦ | ١٥ | دڵمـــــــــەم | دڵەم |
| ٢٩٠ | ١ | خۆڵ | خول |



بەرلەوەی کەخۆم بکەم پێناسەم
زۆر لەخۆم باشتر ئەوان دەناسم
بەڵام ئاخ چبکەم ئابەم دوو دێڕە
چی هەڵبڕێژم من ووتەو باسم

ڕاست بۆوە نەبوو ڕاستی ژێرپێیان
بێ لەمەینەتی چم نەدی پێیان
درۆیە بۆ هەزار جەستە بەشەم کەن
ڕێبوار نەی گرتووە سوار چی بە پێیان